عەمر خالد

و: عبدالجليل على

# بەسەرهاتی تۆبەکاران





چاپی چوارەم
هەولێر / ٢٠٠٩

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك : بەسەرهاتی تۆبە کاران

بابەت : ئایینی

نوسینی : عەمر خالد

وەرگێرانی عبدالجلیل

کۆمپیوتەر: نووسینگەی هیوا

تایپ: زیلان

چاپی : پێنجەم

بۆکارە هونەرییەکان و چاپکردن ( ٠٧٥٠ ١١٨١٩١٩ )

بۆبڵاوکردنەوەو دابەشکردن ( ٠٧٥٠ ٤٦٧١٢٩٤ )

شوێنی بلاوکردنەوە: کتێبخانەی حاجی قادر ی کۆیی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٤١٢)ی ساڵی(٢٠١١)ی پێدراوە.

بــــەناوی خــوای گــــەورە و میهرەبان

اللهم اهدنا واهد بنا واجعلنا هداة للغافلين

# چرپەیەك

وێڕای سوپاس وستایشم بۆ خوای بالآدەست ودروودو سەلام بۆ گیـانی پاکی سەر کاروانی ڕێگـای مرۆڤایـەتی خۆشەویـستﷺ، بەڕاسـتی فەزڵی خوای گەورەیە کە بەر چـاوی ڕوون کـردم، بـۆ ئـەوەی هەسـتم بـــەوەرگێڕانی ئـــەم کتێبـــە (بەســـەرهاتی تۆبـــەکاران) وپێـــشکەش بەخوێنەرانی کورد زمـانی بکـەم، هـەمووومان بەڕاسـتی نـاوە نـاوە پێویستمان بەخوێندنەوەی بابەتی ئیمانی هەیە، بـۆ ئـەوەی بڕوامـان پتەوترو قایمتر ببێت، چ جای ئەوانەی بەرامبـەر ئاییـنەکـەیان سـست وکەمتەرخەمن، بێگومـان زۆربـەی بەسـەرهات وسـەربوردەکانی ئـەم کتێبـە بەخامـەی خـاوەن بەسـەرهاتەکان خۆیـان نوسـراونەتەوە یـان کەسێکی نزیکی خۆیان .

خۆشەویستان بەڕاسـتی دوو هۆکـاری سـەرەکی هـەبوون بـۆ ئـەوەی بەوەرگێرانی ئەو کتێبە هەڵسین:

یەکەم: بۆڕەزامەندی خوای گەورەو لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ

دووەم:بۆ ئەوەی هاوزمانانی کوردمان لەتێگەیشتن وپێگەیـشتنی ئـەو

بەسەرهاتانە بە زمانی شیرینی کوردی بێبەش نەبن، بۆئــەوەی پەنــدو ئامۆژگاری و وانەی لێوەربگرن چونکە پیاو ئەوپیاوەیە وانەلەخــەڵکی وەربگرێت نەك لە بێئاگایی وگومرایی، تەمەنی بەفیڕۆ بچێت. .

*ژیر ئەو کەسەیە کە پەند لە خەڵکی وەرگرێ*

*نەك خۆی بکاتە پەند بۆ خەڵکی تا دەمرێ*

ئیدی سەلامی خوا لە هەموو لایەك، وێڕای ڕێزو خۆشەویستیم، بە ئومێدی سوود لێ وەرگرتنی

وەرگێر

**عبدالجليل علي**

(١)ی ڕەمەزانی/ ١٤٢٧

هەولێر

بسم الله الرحمن الرحيم

وَقالوا أَلْحَمْدُلله الذى هَدانا لِهذا وَما كُنا لِنهتدى لولا أن هدانا الله

## چۆنیەتی هیدایەت

لە ژیانی هەموو مرۆڤێك چەند سات وكات و هەلوێستگەیەك هەیە، یان ئەوەتە بەرەو چاكە، یان بەرەو خراپە دەبیات، هەمانە لەو ساتانە بێ ئاگا دەبێ وژیانی بێ ئامانج تێ دەپەرێ، هەشمانە بە ئاگایەو مەبەستەكانی لە ژیانی دیارە،گوێی لە قسەیەك دەبێ یان ڕووداوێك دەبینێ، یان خوای گەورە نیعمەتێكی لەگەڵدا دەكات، یان تاقی دەكاتەوە بە شتێك،بۆی دەبێتە خاڵی گۆرانكاری و بە ئاگا هاتنەوە، ئینجا لە دوای هۆكارەكان دەگەڕێ و خوای گەورە دەستی دەگرێت و ڕێنوێنی دەكات بەرەو ڕاستی.

بۆیە بایەخم دا بە ئەزموونی خەڵكێك كە چۆن ڕێی ڕاستیان دۆزیەوە؟ لە قورئانی پیرۆزدا زۆر نموونە هەن كە فێری پەندوەرگرتنمان دەكەن لە ئەزموونی خەڵك كە تێ فكریم و ورد بوومەوە لەم تاقی كردنەوانە سەرنجم دا لە ساتەكانی گۆڕانی خەڵك دیتم گەورەترین هۆكاری

هیدایەت نەوەیە گوێ بگری و تێ بگەی کە چۆن بەرانبەرەکەت گۆڕاو هیدایەتی وەرگرت؟ بەم وتە پرشنگدارانە دەست بە نووسینی کتێبەکەم دەکەم و داواکارم، خوای مەزن بیکاتە توێشووی دوارۆژم لە تەرازووی چاکەکانم، لەو ڕۆژەی کە منداڵ و ماڵ و سامان سوودی نیە، تەنها ئەو کەسە نەبێ کە بە دڵێکی بێ خەوش، هاتبێ بۆبەردەم بارەگای خوای کار بەجێ.

*ئیتر سەلامی خوای گەورە لە هەموو لایەك.*

**عەمر خالید**

# « بالاّ پۆشی »

دەمەوێت پەیامێك بنێرم بۆ هەموو خەڵكی بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە و تۆبە بکەن، پێش بەسەر چوونی کات، دەمەوێ ڕاستییەك بیر بخەمەوە هەموو موسڵمانێك لەسەر هەر بستێکی زەوی بە موسڵمانی لە دایك دەبێ، بەدی نەهاتوون مەگەر بۆ خوا پەرستی نەبێ. ڕوو دەکەمە ئەوانەی دەڵێن موسڵمانین, ئایا تۆ بەڕاستی وای؟ ئایا بەرفەرمانی بەوەی کە خوا و پێغەمبەر فەرمانت پێ دەکەن؟ یانیش هەر ئیسلام لە ناسنامەی لە دایك بوونت نووسرایە؟ ئەوە بۆ بیر خستنەوەیە، بەڵام بەسەرهاتم پڕە لە غەم و خەفەت بۆتان دەگێرمەوە لە ڕێگای ماڵپەڕی مامۆستا (عەمرخالید):

من کچێکی تەمەن (٢٠) ساڵی تاقانەی دایك و باوکم، بێجگە لەمن کەسی تریان نیە، لەوەتەی چاوم هەڵ هێناوە بەهەموو مانایەکی ژیان، لەوپەڕی خۆشگوزەرانی، لە قوتابخانەکانی بیانی خوێندومەو بە عەرەبی قسەمان نەدەکرد کە زمانی قورئان و زمانی عەرەبە، لە ماڵەوەش کەس و کارم قسەیان پێ نەدەکرد لەبەر چی؟ نازانم باوکم بۆ! بەڵام دایکم ئەمریکییەو عەرەبی نەدەزانی، هەرچەندە باپیرم عەرەبە، لە منداڵییەوە قسەی پێ نەدەکرد و واگەورە بووە قسە بە زمانمان ناکات، هەر ئەو ڕێسایەشیان بەسەر مندا سەپاند. بەو جۆرە لە منداڵیەوە گەورە بوو، دیتی خزمەکانی بە عەرەبی قسە دەکەن، هیچی تێناگات، ئامۆزاکانی گاڵتەیان پێ دەکرد، لەبەر ئەوەی کە ناتوانم وەکو ئەوان قسە بکەم،

غەمبار بووم و داوام لە باوکم کرد فێری عەرەبیم بکات، پاش داوایەکی زۆر پێ ی گوتم: داپیر و باپیرم و دایکم پێی نەزانن، دەستم بە فێر بوونی زمانی عەربی کرد، لەسەر دەستی مامۆستایەکی ئافرەت، هەوڵم دەدا بۆ ئەوەی فێربم تا شارەزایی ئاینەکەم بم، کەس و کارم لەبەر بەد بەختیم فێریان نەکردووم. بە ژیانێکی سەدا سەد رۆژ ئاوایی دەژیا هیچیان لە ئایینەکەیان و ئەوەی پەیوەندی بە ئایینەکەیان هەیە نەدەزانی، ئەگەر بهاتبایە ماڵی ئێمە، وات دەزانی لە ماڵێکی بیانی دایت لە خراپە، لە خواردنەوەی سەر خۆشکەرو جل و بەرگی ئابڕو بەرو ئاهەنگی نەشیاو، کە خواو پێغەمبەر تورە دەکەن، بۆ وادەکەن؟ لەبەر ئەوەی ئەم شارستانیەتەو کۆمەڵگایە پێشکەوتووە پیاوان ژنان ماچ دەکەن و سەما دەکەن تا کۆتایی شەو، هەر وەکو ئەوەی تەماشای فیلمی رووخێنەر بکەن، بە ناوی شارستانیەتو پێشکەوتن، هەموو ئەمانەم لەبەر چاوە, من هاندەدەن ئەوەی ئەوان دەیکەن منیش بیکەم تا ببمە مۆدێرن، پاش ئەوە بە ماوەیەك ڕاستی ئیسلامم بۆ دەرکەوت.

ئایا خوای گەورە چی لەمن دەوێ؟ بڕیارم داو گوتم: دەبێ بە کردەوە بیپەرستم، لە قسەکەم ترسان، هەروەها داوام لێ دەکردن واز لەو کردەوە ناشیرین و خراپانە بێنن، ڕۆژ بەڕۆژ دەنگەکەم بەرزتر دەبۆوە، لەبەرئەوەی دەنگی ڕاستی بوو، هەوڵیان دا بەهەموو شێوەیەك بێدەنگم بکەن، بۆیە سەرکەوتوو نەبووم. بەڵام بێ ئومێد نەبووم، ئایا چۆن بێ

ئومێدبین کاتێك خوای گەورە داوادەکات لێمان بێ ئومێد و ڕەشبین نەبین، پاشان لەگەڵ مامۆستایەك کە فێری زمانی عەرەبی دەکردم چووینە بازاڕ، بالاپۆش و قورئانێکم کڕی، چوومە ماڵی مامۆستاکەم فێری دەست نوێژ و نوێژی کردم، کەس لە ماڵەوەمان نەیدەزانی، بە ژیانێکی پوچ دەژیان بێ نوێژو ڕۆژو زەکات و حەج، چۆن منداڵێك پەروەردە دەکەن لەسەر ڕەوشتێکی خراپ؟ بۆچی؟ تەنها بۆ کارو خواردن و شەو نخوونی و ڕابواردن.

ئایا بۆ ئەوە بەدی هاتوون؟ بەڵێ بیرو باوڕیان وا بوو، دوور لە خوڕەوشت، بەڵام من زۆر سوپاسی خوا دەکەم ڕێنوێنی کردم بە چاکەو بەخششی خۆی، بۆ لای خۆی بە جوانی و میهرەبانی گەڕاندمیەوە، لەبەر ئەوەی من بەشداری کارە چەپەڵەکانیانم ڕەتدەکردەوە و هەروەها نەم دەویست، خوا لەخۆم تورە بکەم، لەبەر ئەوەی زۆرم خۆشدەویست وپەیوەست بووم بە نوێژو بالاپۆشی و قورئان خوێندن، هەرچەندە لە خوێندنەکەم لەنگیەکی زۆر هەبوو بەهۆی شارەزا نەبوونم لە زمانی عەرەبی، ناخۆشییەکی زۆرم بۆ دروست بوو کەچاوەڕێم نەدەکرد، ئەویش ئەوە بوو کەس وکارم زۆر بە توندی بالا پۆشەکەمیان قەدەغە کرد و لەبەریان داکەناندم، بەدڵ ڕەقی پێیان گوتم: ئەگەر بتبینین بەو جلە ناشارستانی و کۆنە پەرست و پاش کەوتوانە هیچ خۆشی نابێت.

منیش ملم بۆ داوایان کەچ نەکرد و موکوڕ بووم، باوکم هەڕەشەی لێ کردم، ئەگەر بەردەوام بم ئەوە دەمنێرێتە لای دایکی بۆ ئەوەی

خوێندنەکەم لەم ولاّتە تەواو بکەم و بەتەنیا بم . ملم کەچ نەکرد و خواردن وخواردنەوەم رەت کردەوە بۆ ئەوەی دلّیان پێم بسوتی و رێگام بدەن لەسەر ئەوەی خواو پێغەمبەرﷺ پێی رازییە، بەلاّم ساتێکیش بایەخیان پێ نەدام و منیان کردە قوربانیی و ناردمیان بەرەو ولاّتی گاوریی و گوناهــ وتاوان، بەرەلاّیان کردم تا بکەومە ناو لادان و ئەو کردەوانە بکەم، کە ئایینی ئیسلام نەهی لێ کردوە، بەلاّم خوای گەورە لەگەلّم دابوو هیچ کاتێك بەجێی نەدەهێشتم وبەری نەدام وەکو ئەوان، بەلّکو لەگەلّم وەستاو یارمەتی دام، بەزووترین کات چووم بۆ سەنتەری ئیسلامی، راوێژم لەگەلّ هەندێك پسپۆرانی ئەوێ کرد و زۆر سوپاسی خوایان کرد لەسەر ئەوەی من بیری ئەوانم کردووە و چوومەتە لای ئەوان بۆ یارمەتی، دریغیان لەگەلّم نەکرد، بەلّکو پیاوێکی بەتەمەن، کچێکی لەتەمەنی منی هەبوو میوان داری کردم و گوتی: ئەم کچە دەبێتە خوشکت و یارمەتیت دەدات وفێری ئاینت دەکات، گەشتی نوێی ئیمان دەستی پێ کردو دلّم بە خۆشەویستی پەروەردگار نقوم بوو، بەبیرم دێ بەرنامەیەکی مامۆستا عەمر خالید لەسەر صحابی **(ذی البجاذین)** بوو، کە چۆن هەموو شتێکی بە جێ هێشت لەپێناوی خوا, زۆر گریام لەبەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ شایەتی بە برواو خۆشەویستی خواو پێغەمبەری بۆ دا، ئەم صحابیە قورئانی زۆر دەخوێندەوە، تکا کارم لە خوای گەورە منیش وەکو ئەو بم، کە کەس وکارم هاتنە لام وزانیان زیاتر پابەند بوومە هار بوون و قسەی ناشیرینیان پێ گوتم، باوکم وتی ئەگەر نەگەرێیەوە وەکو جاران، هیچ شتێکت

نادەمیّ و لەهەموو شتیّك بیّ بەشت دەکەم، منیش پیّم گوت چیت نەکردووە بیکە، ژیانی دنیا هەر بەسەر دەچیّ، چی دەکەی بیکە ناگەریّمەوە سەردەمی نەفامی، کەتیّدا دەژیایین، تیّپەرین ئەو رۆژانە، ئیستا بەختەوەرترو بەریّزتر دەژیم لە رۆژانی پیشتر، بەختەوەرییەك پیّشتر هەستم پیّ نەکردووە و هەر چی بکەی لەخوام دوور ناخاتەوە، ئامادەم هەموو شتیّك بکەمە قوربانی، لە پیناو ئەوەی خوا لیّم رازی بیّ و بمباتە بەهەشت. من لەو ماڵە سادەیەم لەلای ئەم پیرە میّردە، تکات لیّ دەکەم بگەریّنەوە لای خوا، پیّش ئەوەی کات بەسەر بچیّت، بەلاّم خابن باوکم گویّی نەدامیّ و قسەکەی رەت کردمەوە بیّ ئاوڕ دانەوە رۆیشت، منیش تا ئیستا لای ئەم پیاوە پیرە دەژیم، بۆ پاراستنی ئایین و ناسنامەکەم کە مرۆڤیّکی موسڵمانم و شانازی پیّوە دەکەم. پابەندم بە بەرگی شەرعی کە خوای گەورە فەرمانی پیّ کردووم و نویّژەکانم دەکەم و بەرۆژو دەبم، کەمیّکیش لەخەرجیەکانم دەبەخشم و هەوڵدەدەم بۆ بەدی هیّنانی رەزامەندی وخۆشەویستی خوا، بەڕاستی لەو پەری بەختەوەری دام و چیّژی شیرینی ئیمان دەکەم. هەموو شتیك ئاسان دەبیّ لەرێی خوا، لە هیچ شتیك بیّ ئومید نابیت لەگەڵ خوا، چونکە هەمیشە بەردەوامە بۆ سەرخستنت لەخوا دەپاڕیمەوە جیّگیرم بکات لەسەر باوەڕو کاری چاك، هەر خۆی بیسەرو وەلاّم دەرەوەیە.

# ﴿ شوو برا مردنە ﴾

خالید لە نوسینگەکەی پەست و غەمبار دانیشتبوو، سالحی برادەری لەرووخساری هەستی بەم پەژارەیەی کرد، لە خالید نزیك بۆوەو پێی گوت: خالید ئێمە براو برادەرین پێش ئەوەی هاوڕێی ئیش بین، نزیکی هەفتەیەکە دەتبینم هەمیشە بیر دەکەیەوەو هەمیشە پەشێوی وغەم وپەژارەت پێوە دیارە، وەکو ئەوەی غەمی هەموو دنیات هەڵگرتبێ، هەروەکو دەزانی خەڵك بۆ خەڵکەو خوا هەموومانی کردوتە برا.

خالید کەمێك بێ دەنگ بوو، ئەوجا گوتی: سوپاست دەکەم سالح لەسەر ئەو هەستە ناسکەت منیش وا هەست دەکەم بەڕاستی پێویستیم بەکەسێکە پەژارەو گرفتی خۆمی لەلا هەڵبڕێژم، بۆ ئەوەی یارمەتیم بدا بۆ چارەسەری، خالید ڕاست بۆوە لەدانیشتنەکەی وکوپێك چای بۆ سالح تێکردوگوتی : سالح پرسەکەم مـن هەروەکو دەزانی ئەوەیە خێزانـدارم وهەشت مانگە من وخێزانەکەم بەتەنیا لەماڵێك دەژین، بەڵام برا گچکەم (حەمەد) بیست سالأنە خوێندنی دواناوەندی تەواو کردووەو لەزانکۆ لێرە وەرگیراوە پاش هەفتەیەك یان دوو هەفتەی تر دێتە ئێرە بۆ خوێندن دایك وباوکم داوایان لێکردومە (حەمەد) لەماڵی خۆمان بحەوێنمەوە, لە جیاتی ئەوەی لەئاپارتومانێکی ڕەبەنەکان لەگەڵ برادەرەکانی نیشتەجێ ببێ,

چونکە دەترسن تووشی لادان و گومڕایی بیّ، وەکو دەزانی لەویّ خەڵکی چاك و خراپو هەرچی و پەرچی ژیرو دۆڕاو لەویّ کۆدەبنەوە، هاوڕێش کاریگەری هەیە، منیش ئەو داوایەم ڕەت کردەوە, چونکە بوونی گەنجێکی هەرزەکار لە ماڵ بەمەترسی دەزانم، هەمووشمان بەژیانی گەنجی و هەرزەکاری دا تێپەریوین و چاك دەزانین، ڕەنگە کە لەماڵ دەردەچم، ئەو هێشتا لەماڵ لەژوورەکەی نوستبیّ یان هەندێك جار چەند ڕۆژ بەهۆی کارو کاسبی لە ماڵ دەربچم (..یان ..یان)لێت ناشارمەوە پیاو چاکێك ئامۆژگاری کردم لەو بابەتە پیّ ی گوتم ڕیّ نەدەم بۆکەس کەوا لە ماڵم لەگەڵ خێزانم دابێت، وە ئەم فەرمودەی خۆشەویستی پیّ گوتم: (الحمو الموت) واتە مەترسیدارترین شت خزمانی مێردە، وەکو براو مام وخاڵ وکوڕەکانی، لەبەر ئەوەی ئەوانە زۆر بەئاسانی بەژوور دەکەون وکەسیش گومانیان لیّ ناکات، لەوانەیە ئاژاوەی گەورەو ناهەموار دروست بێت. هەروەها لێت ناشارمەوە کاك سالّح پیاو لەماڵەوە کاتێك جلی خۆی لەبەر دەکاتەوە، لەگەڵ خێزانەکەی بۆ ئەوەی بحەسێتەوە، ئەوەش لەگەڵ برام لەیەك ماڵدا ناگونجیّ، خالید کەمێك بیّ دەنگ بوو، قومێکی لە چایەکەی داو گوتی: ئەو بابەتەم بۆدایك وباوکم باس کردوو ڕای خۆم بۆگوتن وسوێندم خوارد بەخوای گەورە من داوای خۆشی بۆ (حەمەد)ی برام دەکەم، لێم توڕەبوون وشالآویان بۆ هێنام, لەلای خزمان، تاوان باریان کردم بەخراپەو پێناسەیان کردم بەوەی کەمن دڵ نەخۆش و نیاز خراپوو

مەبەست پیسم، لەبەر ئەوەی گومانی خراپە بەبراکەم دەبەم وئەویش خێزانی من وەکو خوشکە گەورەی دادەنێ. پێیان گوتم گوایە من ئیرەیی پێ دەبەم وپێم خۆش نیە، براکەم خۆشی ببینێ، خوێندنی زانکۆ تەواوبکات. لەوەش خراپتر باوکم هەڕەشەی لێکردم وگوتی: ئەوە ئابڕو چونێکی گەورەیە لەناو خەڵکی، چۆن دەبێت برات لەگەڵ بێگانان بێت، تۆش ماڵت هەبێ، بەخوا ئەگەر (حەمەد)نەحەوێنییەوە من ودایکت هەتا دەمرین ناتناسین و ئێمە لە دنیا لێت بەرین پێش قیامەت،خالید کەمێك سەری لەقاندو گوتی: سەرسام بووم لەلایەك دەمەوێ دایك وباوکم ڕازی بکەم، لەلایەك نامەوێ بەختەوەری خێزانی خۆم بدۆڕێنم .ئەدی ساڵح تۆ ڕات چییە لەو گرفتە گەورەیە؟ ساڵح لە دانیشتنەکەی ڕاست بۆوەو گوتی: بەڕاستی تۆ دەتەوێت ڕای من وەربگری بەروون وڕاشکاوی، لەبەر ئەوە گوێم لێبگرە، خالید بەڕاستی تۆ دوو دڵی و ئەگەر نا ئەو هەرایە چیە بۆ ئەو هەموو گرفت وناکۆکیە لەگەڵ باوانت.

ئایا نازانی ڕەزابوونی خوا لەگەڵ ڕازی بوونی باوان دایە، تورەبوونیشی لەگەڵ تورەبوونی ئەوانە، ئەگەر براکەت لەگەڵت لەیەك ماڵدا بژیت ؟! لەکاتی تۆ لەوێ نەبی، بەکاروبار و پێویستی ماڵ هەڵدەستێ دەبێتە پیاوی ماڵ, ساڵح کەمێك بێ دەنگ بوو تەماشای ئاسەواری قسەکەی خالیدی لەرووخساری دەکرد, بەردەوام بوو گوتی :بۆچی گومانی خراپ بەبرات دەبەی بە بێ بەڵگە تاوانباری دەکەی، لەبیرت کرد خوای گەورە

دەفەرمویت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجْتَنِبُواْ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾(الحجرات)

واتـە: ((ئەی ئەو کەسـانەی باوەڕتـان هێنـاوە، خۆتـان زۆر بپـارێزن لـە گومانی خراپ، لەڕاستیدا هەنـدێ لـەو گومانانـە گونـاهو تـاوانن (ت: ئاسان)

پێم بلێ ئایا باوەڕت بەژنەکەت نییە؟ باوەڕت بەبراکەت نییـە؟ قـسەکەی بڕی و گوتی :من باوەڕم بە ژنەکەم وبرایەکەم هەیە بەلام...سالح قسەکەی بەگلەیەوەو بڕی وگوتی: دیسان هاتینەوە سەرگومان وخەیاڵ، بـاوەڕ بکـە خالید (حەمەدی) برات دەبێتە شوانێکی دەست پاك بۆ ماڵەکـەت لـەوێ بی یان نا، نابێ بیر بکەیتەوە توخنی براژنی بکەوێ لەبەر ئەوەی بەچـاوی خوشکی خۆی تەماشای دەکات. ئەی خالید لێت دەپرسـم ئـەرێ ئەگـەر (حەمەد)ی برات خێزاندار با، ئایا دڵـت بـۆی دەچـوو پـەلاماری بـدەی؟ وابزانم وەلامەکـەت لـەلای خـۆت دیـارە، بۆچـی دایـك وباوکـت وبـرات دەدۆڕێنی جیاوازی و نـاکۆکی دەخەیـە نـاو خێـزان، بەخـەیاڵ وگومـانی نارێك، ژیربە باوانت ڕازی بکە هەتا خوات لێ ڕازی بێ، بۆ رازی کـردن و دڵ نەواییت، ئامۆژگاریت دەکـەم (حەمـەد)ی بـرات لەبەشـی پێـشەوەی ماڵەکەت جێ بکەوە، دەرگای نێوان بەشی پێـشەوەو ژوورەکانـت داخـە. خالید بە قسەی (سالح)ی برادەری ڕازی بوو، هیچ چارەی نەما بڕیـاری دا

(حەمەد)ی برای لەگەڵ خۆی لەماڵیان جێبکاتەوە. پاش چەند ڕۆژێك (حەمەد)ی برای گەیشتە فرۆکەخانە, خالید چوو پێشوازی لێکردو پێکەوە هاتنەوە ماڵێ، لەپێشەوەی ماڵ (حەمەد)ی نیشتەجێ کرد، بەو جۆرە کار بەڕێوە دەچوو، ڕۆژگار تێپەری، قەزاو قەدەر لەزانستی خوا دایە، پاش چوار ساڵ خالید تەمەنی گەیشتە سی ساڵو باوکی سێ کوڕیەیە. (حەمەد)یش لەساڵی کۆتایی خوێندنیەتی، نزیك بۆتەوە لەدەرچونی لە زانکۆ، (خالید)ی برای بەڵێنی پێدابوو، پیشەیەکی شیاوی بۆ پەیدا بکا لەزانکۆ، بۆ ئەوەی لەگەڵی بمێنێتەوە تا ژن دەهێنێ، لەگەڵی بچێتەوە ماڵی خۆی. شەوێك خالید بەئوتومبێلەکەی دەگەڕایەوە، کات دوای نیوە شەو بوو، بەکۆلانێکی نزیك ماڵی خۆیان دا تێپەڕی، دوو تارمایی ڕەشی لەسەر شۆستەکە بەدی کردوو لێیان نزیك بۆوە، دیتی کچێك لەسەر زەوی ڕاکشاوە ژنێکی لەگەڵە، هاوار دەکاو دەڵێ: (بەهانامان وەرن خەڵکی خێرخواز ڕزگارمان بکەن). خالید تاساو لێیان نزیك بۆوە پرسیاری کرد بۆچی لێرەنە؟ پیرەژن گوتی: ئێمە خەڵکی ئەم شارە نین، تەنیا هەفتەیەك لێرە دەمێننەوە وکەسیش ناناسین، ئەو کچەش کچی خۆیەتی تووشی ژانی منداڵ بوون بووە، مێردەکەشی بۆ کاسبی چووەو کچەکە خەریکە لەبەر ژان وتازار بمرێت، کەسیان دەست ناکەوێ بیانباتە نەخۆشخانەی منداڵ بوون. پیرەژنەکە بەچاوی پڕ فرمیسك پێ ی گوت: تکایە پێت ماچ دەکەم، کارێکی چاکمان لەگەڵ بکەو بمان گەینە نزیکترین نەخۆشخانە خوا

خێزان و منداڵت بپارێزی لە هەموو خراپەیەك، فرمێسكی پیرەژن و زریكەی كچەكە یەكیان گرتبوو، خالید دڵی پێیان سووتا، پاڵنەری پیاوەتی و خێرو كۆمەكی لێ قەوماو بە هاناوە چوونی بێ نەوایان بوو، كە بیگەیێنێتە نەخۆشخانە و یارمەتی پیرەژنی داو كچەكەیان خستە ناو ئوتومبێل و بەخێرایی دەرچوو بەرەو نەخۆشخانەی لە دایك بوون، پیرەژن‌و وكچەكە بەدرێژایی ڕێگا لەنزاو پاڕانەوە نەكەوتن بۆ خۆیی‌و ماڵ ومنداڵی. پاش كەمێك گەیشتنە نەخۆشخانە، پاش پشكنین كچەكەیان بردە ژووری نەشتەرگەری بۆ نەشتەرگەری (قەیسەری)بۆ ئەوەی منداڵەكەی ببێ، خالیدیش لەبەر پیاوەتی و دڵنەرمی و بەخشندەی خۆی بەجێی نەهێشت و مایەوە، بۆ ئەوەی دڵنیا بێ لە ڕزگار بوونی بە پیرە ژنیشی گوت، لە شوێنی پیاوان چاوەڕێتان دەكەم تا مزگێنی ڕزگاربونم دەدەنێ و تەلەفۆنی بۆ ژنەكەی كردو گوتی: نیگەران مەبن، درەنگ دێمەوە. خالید لە شوێنی پیاوان دانیشت بوو پشتی خۆی بەدیوار دابوو،خەو بردیەوەو هەستی پێ نەكرد ونەیزانی چەند خەوی لێكەوتوە، بەڵام ئەوەی لە بیری ناچێ ئەو دیمەنە بوو، كە بەهاوارێك بە ئاگاهات چاوی هەڵهێنا، بینی دوو پیاوی ئاسایش لێی نزیك دەبنەوە پیرەژنەكە دەقیژێنێ ودەناڵێنەوەو دەستی بۆ درێژ دەكاو دەڵێ: ئەوە هەوە !...ئەوە خۆیەتی!!... خالید سەری سوڕماو هەستاوە لەسەر كورسیەكەی و بەرەو دایكی كچەكە چوو گوتی: كچەكەت ڕزگاری بوو. پێش ئەوەی پیرەژنەكە هیچ بڵێ، ئەفسەر

ئاسایشەکە گوتی : تۆ خالیدی ؟ گوتی: بەڵێ. ئەفسەرەکە گوتی: پێنج خولەك وەرە بۆ ژووری بەڕێوەبەر، هەموویان چوونە ژووری بەڕێوەبەر، دەرگایان داخست، پیرەژن دەستی بەهاوارهاوار کردو ڕووی خۆی دەڕناندەوە وپرچی دەردەهێناو دەیقیژاند: ئەوە تاونبارە سپلەکەیە بیگرن بانەڕوا، هەش بەسەرت کچەکەم! خالید هەندە بێ هۆش وسەرسام ما؟! لە هیچ تێناگات، لە سەرسامی خۆی بە قسەی ئەفسەرەکە وەئاگا هات: ئەو پیرەژنە دەڵێ: تۆ زینات لەگەڵ کچی کردووە ولەتۆ زگی بووە و ئەو منداڵە لەتۆ بووە، هەڕەشەت لێ کردووە وپەیمانت دایتێ بیخوازی، بەلام پاش منداڵ بوون ساوایەکە لەبەر دەرگای یەکێك لە مزگەوتەکان دابنێن وهەتا خێر خوازێك بیباتە خانەیەکی چاودێری کۆمەلایەتی. خالید بەبیستنی ئەم قسانە ڕاچڵەکی و بەر چاوی تاریك بوو وزمانی گیراو قسەی پێ نەکرا و کەوتە سەر زەوی و لەخۆچوو. پاش کەمێك بەهۆش خۆی هاتەوە، دیتی وا لە ژوورێکە و دووپیاوی ئاسایش لەسەری وەستاون، ئەفسەرەکە دەستی بەقسە کردوو گوتی: خالید بەڕاستی پێم بڵێ لەدەم و چاوت دیارە تۆ پیاوەکی بە ڕێزی، لە سیمات دیارە کە تۆ لەو کەسانە نی لەو جۆرە تاوانە چەپەلانە بکەی. خالید بە دڵی شکاو گوتی: ئەی خەڵکینە ئەرێ ئەوە پاداشتی چاکەیە، بەو جۆرە چاکە دەدرێتەوە، مـن پیاوێکی پاکم و بەناموسم و خاوەن خێزانم سێ منداڵم هەیە دوو کوڕو کچێك(سامی وسعود،وهەنادی)و خەلکی ئێرەم و لە گەرەکێکی ناسراو،

خالید خۆی پێ ڕانەگیراو فرمێسك لە چاوانی دەباری، ئەفسەرەکە پێی گوت: کارەکەت ئاسانە من باوەڕت پێ دەکەم کە تۆ بێ تاوانی، پێویستە پاکی تۆ ئاشکرا بێت، ئەوەش ئاسانە، لەم جۆرە ڕووداوانە تەنیا هەندێك پشکنینی پزیشکی تایبەت دەکرێ، بۆ ئەوەی ڕاستی ئاشکرا بکرێ!! خالیدیش قسەکانی بڕی کام ڕاستی! من بێ تاوانم پاکو بەناموسم! دیارە باوەڕم پێ ناکەن، سەگیش بە وەفایە بەرامبەر ئەوانەی چاکەی لەگەڵدا دەکەن، بەڵام زۆر کەس ستەم و سپڵەیی دەکەن بەرامبەر ئەوانەی چاکەیان لەگەڵدا دەکەن...! بەیانی هەندیك لە ئاوی سپێرمی خالیدیان وەرگرت و ناردیان بۆ تاقیگە بۆ پشکنین و تاقیکردنەوەی پێویست، خالید وئەفسەرەکە لە ژوورێکیتر دانیشتبوون خالید وازی نەدەهێنا لەنزاو پاڕانەوە لەسەر ئەوەی هەرچی ڕاستییە ئاشکرا بێ!. پاش دوو کاتژمێر ئەنجامێکی سەرسوڕهێنەر دەرکەوت لە ئەنجامی پشکنینە کە داوێن پاکی خالید لەم تاوانە ئاشکرا، خالید لە خۆشیان هیچی پێ نەکرا تەنیا ئەوە نەبێ کڕنۆشی شوکرانە بۆ خوای گەورە ببا، لەسەر ئەوەی کەپاکی بەدیار کەوت و ئەفسەرەکەش داوای لێبووردنی لێکرد لەسەر ئەوەی کە نیگەرانیان کرد، ئەوجا پیرەژن وکچە ناپاکەکەیان بردە بەشی پۆلیس بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵیان و جێ بەجێ کردنی فەرمانی پێویست لەگەڵیان.... خالید سور بوو لەسەر ئەوەی پێش نەخۆشخانە بەجێی بێڵێ بچێ خوا حافیزی لە پزیشکی پسپۆڕ بکا کە بە ئیشەکە هەڵستاوە، چووە لای لە

ژووری تایبەتی خۆی بۆ خوا حافیزی وسوپاس کردنی لەسەر ماندوو بوونی، بەڵام پزیشك لە ناکاو پێی گوت: ئەگەر رێم بدەی دەمەوێ لە جێگایەکی تایبەت چەند خولەکێك بتبینم. شڵەژانی پزیشك دیاربوو، پاشان ئازایەتی هێنایە بەر خۆی و گوتی: بەڕاستی کاك خالید لەو پشکنینانەی کردمان گومانم هەیە لەسەرت کە نەخۆشیەکت هەیە!!...
بەڵام لەوە دڵنیانیم، لەبەر ئەوە دەمەوێ چەند پشکنینێك لەسەر هاوسەرەکەت ومنداڵەکانت بکەم . خالید بەترس ودڵە راوکێ لەسەر روخساریەوە گوتی: توخوا دکتۆر هەرچی هەیە پێم بڵێ، رازیم بەقەزا وقەدەری خوا، بەڵام گرنگ لەلای من منداڵە ساوایەکانمە، ئامادەم بۆ قوربانی لە پێناویان، ئینجا دەستی بەگریان کرد، دکتۆر دەستی کرد بەهێورکردنەوەی ودڵنیا کردنی ئینجا پێی گوت: بەڕاستی من ئێستا ناتوانم هیچ شتێکت پێ بڵێم هەتا دڵنیا نەبم لەپشکنینەکە، چونکە رەنگە گومانەکانم لە جێی خۆی نەبێت، بەڵام خێرا هاوسەرەکەت و هەر سێ منداڵەکەت بێنە. پاش چەند سەعاتێکی کەم، خالید هاوسەری ومنداڵەکانی هێنایە نەخۆشخانە، ئینجا دەستیان کرد بەپشکنینی پێویست وئەوانی بردە ناو ئوتۆمبێلەکە، هاتەوە، تاکەمێك قسە لەگەڵ دکتۆر بکات، کاتێك پێکەوە قسەیان دەکرد زەنگی مۆبایلی خالید لێیدا، وەڵامی دایەوە، دکتۆرەکە پێ ی گوت : ئەوەکێ بوو پێت گوت دەرگای شوقەکە نەشکێنی؟!! گوتی: ئەوە (حەمەد)ی برامە لەگەڵمان

لەناو ماڵ نیشتەجێیە کلیلی شوقەکەمانی ون کردووە داوام لێدەکات، زوو بچمەوە تا دەرگای بۆ بکەمــەوە، دکتۆرەکـە بەسەرسـامی گـوتی : ئـەو برایەت لەکەیەوە لەگەڵتان نیشتەجێیە؟! خالید گوتی : ماوەی چوار ساڵەو ئێستا لە خوێندنی کۆتـایی زانکۆیـە . دکتۆرەکـە پێـی گـوت : دەکـرێ ئەویش بهێنی بۆ ئەوەی هەندێك پشکنینی بۆ بکەین؟ بۆ ئەوەی دڵنیا بین نەخۆشییە کە زگماکە یان نا؟! ئەوجا خالید گوتی : بەدڵخۆشییەوە بەیانی لــەلات ئامادەیــە!! لــەکاتی دیــاریکراو خالیــد و حەمــەدی بــرای لــە نەخۆشخانە ئامادەبوون و پشکنینی تایبەتیان بـۆ کـرا، دکتۆرەکـە داوای لەخالید کرد، پاش یەك هەفتە سەردانی بکات، بـۆ زانینــی دەرئــەنجامی کۆتایی و دڵنیا بوون.. خالید بە درێژایی ئەم هەفتەیە بە پەشۆکاوی و دڵە ڕاوکێ مایەوە. لەکاتی دیـاریکراو هاتــەوە لای دکتۆرەکـە ئـەویش زۆر بەدڵخۆشی پێشوازی کرد، داوای کوپێك ئـاوی لیمـۆی کـرد، بـۆ ئــەوەی مێشکی هێور ببێتەوە، پزیشك باسـی ئـارام گـرتن لەسـەر لێقـەومان و نەهامەتیەکان وئەو دنیایە حاڵی هەر ئەوهایەی دەکرد!! خالیـد قـسەکەی بڕی و گوتی: توخوا دکتۆر لەمە زیاتر مەمسوتێنە، من ئامـادەم لەسـەر هەر نەخۆشییەك خۆم ڕابگرم، ئەوە قەزاو قەدەری خوایە بەڕاستی مەسەلە چی یە؟ پزیشکەکە کەمێك سەری لەقاند و گوتی: زۆر جار ڕاستی تاڵ وپڕ ئێش و ئازارە !! بەڵام هــەر دەبـێ ڕاسـتی بزانـی و بـەرەنگاری ببیــەوە!! بەڕاستی هەڵاتن لە بەرەنگار بوونەوە گرفـت چارەســەر ناکـات و ڕاسـتی

ناگۆڕێت. پزیشکەکە کەمێك بێ دەنگ بوو..ئینجا قسەکەی تەقاندەوە گوتی: خالید تۆ نەزۆکی و منداڵت نابێت !!!هەر سێ منداڵەکە لەتۆ نینە، بەڵکو ئەوان لە حەمەدی براتن ...خالید توانای بیستنی ئەو رووداوە کوشندەی نەکرد، قیژاندی بەهاوارێکی گەورە سەدای دایەوە لە نەخۆشخانەکە ئینجا کەوت و لەهۆش خۆی چوو. پاش دوو هەفتە خالید لە بێ هۆشیە درێژەکەی بەخەبەر هاتەوە بۆ ئەوەی هەموو شتێك لە ژیانی ببینێ خالید توشی نیوە شەلەل وهۆش لە دەستدان بوو، لەئەنجامی ئەو کۆستە لە ناکاوە، هەڵیان گرت بردییانە نەخۆشخانەیەکی عەقلی هەتا ئەوەی لە ژیانی ماوە لەوێ بێ .

بەڵام ژنەکەی بردرا بۆ دادگایەکی شەرعی بۆ ئەوەی دان بە ڕاستیەکان دابنێ بەپێی شەرع بەرد باران بکرێ هەتا مردن. بەڵام حەمەدی برای ئێستا لە ژوورە تاریکەکانی زیندان دایە چاوەڕێی دەرچوونی سزای شەرعی خۆی دەکات. بەڵام سێ منداڵە کۆسکەوتووەکان بردرانە خانەیەکی چاودێری کۆمەڵایەتی بۆئەوەی لەوێ لەگەڵ منداڵەبێ نازەکان بژین .

## ﴿ کوڕی قەشەکە ﴾

لەو فڕۆکەیەی سوار ببوم لە شاری (جدە)بەرەو پاریس، پاش ناسین وگفتوگۆم لەگەڵ کرد، سەری بەسەرینی کورسیەکە کرد بوو دەیویست بنوێ پێم گوت: **السلام علیك** باوکی محەمەد ئەوە لە کێندەرێی پیاو؟ بەڕاستی ڕێکەوتێکی خۆشە لەناو فرۆکە پێت دەگەم، نایەڵم بخەوی، ئێستا کاتی خەوتن نییە ئەدی نابینی ئەو مێوانانە پێویستیان بە ڕێنمایی و ئامۆژگاری هەیە، هەستە قۆل وباسکت لێ هەڵماڵە بەڵکو خوا لەسەر دەستی تۆ کەسێك هیدایەت بدات، بۆتۆ باشترە لەوشتری سوور، ئەدی ئێمە کۆمەڵێکی بانگ خواز نین؟ خەو بۆ چی یە؟ لەمرۆوە حەسانەوە نی یە کەی وەختی پاڵدانەوەیە؟ پیاوەکە چاوی هەڵهێناو سەرنجی دام ونەیناسیم هەتا هەستایەوە، گوتی: دکتۆر سەرحان ئەوە تۆی؟ ڕاستە! لەسەر زەوی ناتبینم لە ئاسمان نەبی بەخێربێی پێش بینیم نەدەکرد لەناو فرۆکە بتبینم، بەڵام بەراستی لە بیرم بووی، پێش بینیم دەکرد لە فەرەنسا یان لە خوارووی ئەفریقا بتبینم، ئەرێ ئێستاش لەوێ کار بەدەستی، هەربەرێوە بەری نوسینگەی رابیتەی؟ توخوا پێم بڵێ لەو ساتە جوانانەی دەتبینم لە بەرامبەرم وەستاوی؟ بەراستی باوەڕ ناکەم، دەرفەتێکی باشە! باوەڕ بکە برام... ئەدی نابینی لە پێشت ڕاوەستاوم بە دەنگ و ڕەنگم، بیر لە چی دەکەیتەوە، دەبینم تێکچووی؟ بیرم لەو ڕۆژانەی منداڵە دەساڵییەی موسڵمانەی لە جۆهانبێرگ بینیم دەکردەوە. باوکە قەشەکەشی موسڵمان نەبوو، ئەوەی بە ڕۆڵەکەی کرد با بەدەواری شڕی

نەكردوە !- چی؟ منداڵێك موسوڵمان بوو باوكی قەشە بوو.. هەستە.. هەستە ئێستا.. ئەو ڕووداوەم بۆ بگێرەوە، بەڕاستی چیرۆكێكی خۆشە توخوا بۆم بگێڕەوە، بەراستی رووداوێكی لەخەیال نامۆیە، بەلاّم ئەگەر خوای گەورە شتێك بكات دەیكات، هەموو گەردوون بەدەست خۆیەتی، بیّ گەردی بۆ ئەو، كێی بیەوێ رێنوێنی دەكات، كێشی بوێ گومڕای دەكات. ئەمەش چیرۆكەكەیە... لە شاری جوهانسبێرگ لە مزگەوت نوێژم دەكرد، منداڵێكی دەساڵیم دیت بە كراسێكی شۆڕی عەرەبی، واتە بەرگێكی سپی و عەبایەكی عەرەبی خەلیجی خستبوە سەر شانی، لەسەریشی كوفی و عەگالێكی بەستبوو سەرنجی راكێشام، ئەوە لە داب و نەریتی خەڵكی خوارووی ئەفریقانییە ئەو جل و بەرگە لەبەر بكەن، ئەوان پانتۆرو كراس لەبەر دەكەن، كوفی لەسەریان دەكەن ئەوان بەرگێكی ئیسلامی دەپۆشن، موسڵمانانی هیندو پاكستان پێی دەناسرین.. بەلامدا تێپەری سەلاّوێكی موسلمانانەی لیّ كردم، وەلاّمم دایەوە، پێم گوت: تۆ سعودیی؟ گوتی: نەخێر من موسڵمانم، پەیوەستم بە هەموو ولاّتانی ئیسلام، سەرم سورماو لێم پرسی: لەبەر چی ئەم بەرگە خەلیجیە دەپۆشی؟ وەلاّمی دامەوە: شانازی پێوە دەكەم، ئەوە پۆشاكی موسڵمانانە، پیاوێك بەوێدا تێپەری منداڵەكەی دەناسی گوتی: لێی بپرسە چۆن موسڵمان بووە، سەرسام بووم لە پرسیاری ئەو پیاوە بە كابرام گوت: ئەدی موسڵمان نەبوو؟ ئەوسا پرسیارم لە منداڵەكە كرد، پێشتر موسڵمان نەبووی؟ ئایا لە خێزانێكی موسڵمان نەبووی؟ منداڵەكە پێی

گوتم: چیرۆکەکەمت لە سەرەتاوە بۆ دەگێرمەوە، بەلاّم پێشەکی پێم بلّیٚ تۆ خەلّکی کێندەرێی؟ من خـەلّکی مەککـەی پـیرۆزم. هـەر کـە منداڵەکـە بیستی من مەککەییم بەرەو رووم هات و دەیویست دەست لە ملـم بکـاو ماچم بکا، دەیگوت: لە مـەککە! لەمەککـە! چـەند بەختـەوەرم پیاوێـك ببینم لە مەککەی پیرۆز، شاری پیرۆزی پیغەمبەری خوا، بـە پەرۆشـم بـۆ دیتنی، سەرسام بووم لە قسەی کوڕەکە، پێم گوت: توخـوا چـیرۆکەکەتم بۆ بگێڕەوە... منداڵەکە گوتی: من لە باوکێکی قەشە کریستیانی بـووم، لەشاری شیکاغۆی ئەمەریکا دەژیام، هەر لەویٚ پـەروەردە بـووم و فێـری خوێندن ونوسین بووم لەباخچەیەکی ساوایانی ئەمەریکی سەر بەکەنیسە.
بەلاّم باوکم زۆر بایەخی پێدەدام لە لایەنی پەروەردەوە، هەردەم دەیبردمـە کەنیسە، پیاوێکی بۆ پەروەردە و فێرکردنم تەرخان کردبوو، ئینجـا بـاوکم لـە کتێبخانـەی کەنیسـە بـەجیٚ ی دەهێـشتم، بـۆ ئـەوەی ئـەو گۆڤـارە تایبەتیەی منداڵان بخوێنمەوە، بەسەرهاتەکانی مەسیحی تێدابوو. ڕۆژێـك لەڕۆژان لەکتێبخانە بووم دەستم برد بۆ کتێبێکی سەرتاقەکە، ناونیـشانی کتێبەکەم خوێندەوە ئینجیل بوو. کۆنە کتێب بوو. لەبێچاری خۆم ویـستم لاپەڕەکانی وەرگێڕم، پاکی بۆ خوا هەر کە کتێبەکەم کردەوە لەگەڵ یەکەم سەرنجم، چاوم کەوتە سەردێرێکی سەیر، کە دێرەکەم خوێندەوە نوسـرابوو. ئەوەش بە دەسـت کارییـەوە وەرگێڕانەکەیـەتی کـە مەسـیح فـەرمووی لەپاشی من پێغەمبەرێکی عەرەب دێت کەناوی (احمد)ـە، سەرسام بـووم بەم دەستەواژەیە، دەرپەڕیم چوومە لای باوکم زۆر بەسادەیی لـێم پرسـی:

بابە، ئایا ئەو وشەیەت لە ئینجیل خوێندۆتەوە؟ دیوتە؟ باوکم وەڵامی دامەوە: کام وشە کورم؟.. لێرەیە لەم لاپەرەیە، قسەیەکی سەیر هەیە مەسیح دەڵێ پێغەمبەرێکی عەرەب لە پاشی ئەو دێ: بابە ئەم پێغەمبەرە عەرەبە کێ یە؟ مەسیح باسی کردووە ؟ودەڵێ ناوی (احمد)ـە ؟...ئایاهاتووە یان نەهاتووە، بروام پێ بکەن برایان حەزم کرد گەشتەکە درێژبێتەوە، بۆ ئەوەی چیرۆکەکە تەواو ببێ.بەراستی چیرۆکەکەو رووداوەکانی هەرکە باوکی مەحمەد دەستی پێکرد تامەزرۆی کردم... گوتم: باوکی مەحمەد تەواوی کە، کاتەکە کورتە.. زووکە باوکی مەحمەد گوتی .، ئەگەر دەتەوێ تەواوی بکەم.. پێم مەبرە پێم گوت: باوکی محەمەد دەمەوێ پاشماوەی چیرۆکەکە زوو بزانم... باوکی محەمەد گوتی: لەو کاتە قەشەکە بەسەر سەری منداڵە بێ تاوانەکەدا هاواری کرد: ئەو کتێبەت لە کوێ هێنا؟ بابە لە کتێبخانەی خۆت، کتێبخانەی کەنیسە، کەخۆت لێ ی دەخوێنیەوە، باوکی محەمەد گوتی: ئەو کتێبەم پێ نیشان بدە، بەراستی درۆو بوختانی تێدایە لەسەر گەورەمان مەسیح... بەڵام لەناو کتێبەکەدایە، بابە لەناو ئینجیل دایە، ئایائەوە نابینی لەناو ئینجیل دایە؟.. باوکی محەمەد گوتی: ئەوە چیتە، بەراستی تۆ تێناگەی لەم کارانە، هێشتا بچووکی بابچینەوە ماڵێ. وەرە، باوکم دەستی راکێشام وبردمیەوە ماڵەوە، دەستی بەهات وهاوارو هەرەشەکرد کە ئەوهاو ئەوهات لێدەکەم، ئەگەر من واز لەو کارەنەهێنم... بەڵام زانیم نهێنیەك هەیە باوکم دەیەوێ لێم بشارێتەوە. خوای گەورە رێنمونی کردم

دەست بکەم بە گەڕان بە دوای هەموو نەوشتانەی بەعەرەبی نوسراوە بۆ ئەوەی بگەمە دەرئەنجام.. دەستم کرد بەگەڕان بەدوای عەرەب بۆ ئەوەی پرسیاریان لێ بکەم، چێشتخانەیەکی عەرەبانم لەشارەکەم دۆزییەوە، تا لەبارەی ئەم پێغەمبەرە عەرەبە بپرسم، خاوەنی چێشتخانەکە پێی گوتم: برۆ بۆ مزگەوتی موسوڵمانان، لەوێ لەمن باشتر بۆت باس دەکەن... چوومە مزگەوتەکە بانگم کرد: ئایا عەرەب لێرە هەیە، کەسێك گوتی: چیت لەعەرەبان دەوێت؟.. پێم گوت: (دەمەوێ دەربارەی پێغەمبەری عەربی کە (احمد)ـە پرسیار بکەم؟..) یەکێك گوتی: (فەرموو دانیشە چیت دەوێت بزانی لە بارەی پێغەمبەری عەرەبی؟...) گوتی: (بەڕاستی خوێندومەتەوە کە مەسیح لەئینجیل دا کە لە کتێبخانەی کەنیسە دایە دەڵێت پێغەمبەرێکی ترناوی (ا حمد)ـە لەپاشی خۆی دێت.ئەرێ ئەوە ڕاستە؟) پیاوەکە گوتی: (ئایا بەڕاستی ئەوەت خوێندەوە؟... ئەوەی دەیلێیت ڕاستە کوڕم؟، ئێمەی موسوڵمانیش شوێنکەوتەی پێغەمبەرە عەرەبەکەین کە (ﷺ)ـە بەڕاستی قورئانەکەمان باسی کردووە وەکو ئەوەی تۆ باسی دەکەی، یەکسەر منداڵەکە هاواری کرد، وەکو ئەوەی گومبوەکەی دۆزیبێتەوە: (ئایا ئەوە ڕاستە؟!!)(بەڵێ ڕاستە... کەمێك چاوەڕێ بکە..) پیاوەکە چوو دانەیەك قورئانی وەرگێڕدراوی وشەکانی لەسورەتی (الصف)دەری هێنا کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿... وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾﴾(الصف) منداڵەکە هاواری کرد:(کانیشانم بدە) پیاوەکە ئایەتە

وەرگێردراوەکەی پێ نیشاندا.. منداڵەکە هاواری کرد ئەی خوا هەر ئەوەیە کە لە ئینجیل دایە... مەسیح درۆی نەکردوە، بەڵام باوکم درۆی لەگەڵ کردم، چی بکەم بۆ ئەوەی ببمە شوێن کەوتەی ئەم پێغەمبەرە ﷺ گوتی: شەهادە بێنە **"أشهد أن لا أله الا الله، وأن محمدا عبده ورسوله"** عیسای کوری مەریەم بەندەو نێردراوی خوایە، منداڵەکە شەهادەی، هێنا پاشان گوتی: موژدە بدە بەم پێغەمبەرە کە ئەمڕۆ چەند بەختەوەرم، دەچمە لای باوکم موژدەی دەدەمێ..) منداڵەکە لە خۆشیان دەرپەری بەرەو لای باوکە قەشەکەی: (بابە، بابە، بەڕاستی ڕاستیم ناسی... بەراستی عەرەب و موسڵمان لە ئەمەریکا هەنەو شوێنکەوتەی ﷺ قورئانم لەلایان بینی و باسی هەمان دێر دەکات کە لە ئینجیل پێتم نیشاندا.. منیش موسڵمان بووم... ئێستا من موسلمانم، باوکە گیان وەرە لەگەڵم ئیسلام بە، دەبێ شوێن کەوتەی ئەم پێغەمبەرە بین بەو شێوەیەی عیسا ﷺ لە ئینجیل باسی کردووە) قەشەکە وەکو هەورە تریشقە بەسەری دا بکەوێ.. کوڕە بچووکەکەی ڕاکێشاو بردیە ژورێکی بچووك دەرگای لەسەر داخست، زینندانی کرد.. داوای کرد بەزەیی پێ نەکرێ.. لەزیندانەکە چەند هەفتەیەك مایەوە.. خواردن و خواردنەوەی بۆ دەهات، دەرگایان لەسەر دادەخستەوە، پاش ئەوەی ترسا نەوەك ئیشەکەی لەلایەن دەسەلاتدارانی حکومەت ئاشکرا بێت- پاش ئەوە فێرگەکەی کوڕەکەی تێدا دەیخوێند دەگەڕان و دەیان پرسی دەربارەی بزر بوونی- لەوەش ترسا کارەکە پەرە بسێنێ، بیبەنە زیندان وبیری دەکردەوە، کە کوڕەکەی بنێرێتە

ولآتی تەنزانیا لەئەفریقا، دایك وباوکی قەشــەکە لــەوێ بــوون: بەڕاســتی ناردیە ئەوێ پێیانی گوت کە ڕەحمی پێ نەکەن، ئەگەر گەڕاوە سەر قــسەو هورێنەکانی (وەکو دەڵــێن) داوای لێ کــردن ئەگــەر پێیــان بلــی بیکــوژن بیکوژن لەوێ، چونکە لە ئەفریقا کەس بــەدوای دا ناگــەڕێ!! منداڵەکــە کۆچی پێ کرا بۆ تەنزانیا.. بەڵام ئیسلام بوونەکەی لەبیر نەکرد.. بــەدوای عــەرەب و موسڵمانان دەگەڕا، هەتا گەیشتە مزگەوتێك لەگەڵیان دانیــشت و باسی خۆی بۆ کردن و دڵیان پێی سوتا.. ئەوانیش فێری ئیــسلامەتییان کرد، بەڵام باپیری پێی زانی .. گرتی و زیندانی کرد وەکو باوکی دەســتی بە ئازاردانی کرد، بەڵام نەیتوانی کوڕەکە بگێڕێتەوەو پاشگەزی بکاتــەوە، نەیتوانی ئەوەی دەیەوێ پێی بکات، زیندانی وئازاردانی زیاتر کرد، هێــزو خۆڕاگری پتر بوو.. باپیری ویستی خۆی لێ ڕزگار بکات، ژەهــری بــۆ لــە خواردن کرد بەڵام خــوا ڕەحمــی پــێ کــرد نــەمرد، پــاش ئــەوەی کــەمێك خواردنەکەی خوارد هەستی بەژانەسك کردو ڕشایەوە، ئــەوجا لــەم ژوورەی کە تێــدا بــوو خــۆی فرێــداو کەوتــە نــاو باخــچەکە و بــەخێرایی ئــەوێی بەجێهێشت بەرەو مزگەوت ڕای کرد موسڵمانەکان بــەخێرایی چارەســەری پێویستیان بۆ کرد، هەتا خوای گەورە شیفایدا، پاشان داوای لێکردن، لای خۆیان بیشارنەوە ئینجا لەگەڵ کەسێك بەرەو (ئەسیوبیا) هــەلآت ولــەوێ بەدەیان کەس لەسەر دەستی موسڵمان بوون لەباوکی مەحەمــەدم پرســی: (چی... دەیان کەس لەسەر دەستی موسڵمان بوون؟) هــاواری کــرد بــێ دەنگ بە ئەگەر دەتــەوێ بەســەر هاتەکــەی تەواوکــەم... ویــستم بــاوکی

مەحەمەد گوتی : کورەکە پێی گوتم موسڵمانەکان لە ژیانم ترسان، ناردمیانە خوارووی ئەفریقا، ئێستاش وا لێرەم لە کۆڕی زانایان دادەنیشم وئامادەی کۆمەڵانی بانگ خواز دەبم لەهەر کوێ بن وبانگی خەڵك دەکەم بۆ ئیسلام، چونکە ئەم ئایینە ڕاستەو پاکە.. ئەو دینەی کە خوا داوامان لێ دەکا شوێن کەوتەی بین.. کۆتا ئاین ئەم ئایینەیە عیسا (علیه السلام) مژدەی پێ داوە، پێغەمبەر ﷺ لەدوای ئەو دێ و لەسەر جیهان پێویستە بەدوای بکەون، بەڕاستی کریستیانەکان بەدوای مەسیحی ڕاستەقینە بکەون لە دنیاو دوایی بەختەوەر دەبن، ئەوەیە ئینجیلی ڕاستەقینەی من دۆزیمەوە لە کتێبخانەی کەنیسە (شیکاغۆ)، دەڵێ: خوای گەورە بەسەر ئەو پەرتوکەی ڕاگەیاندم، من کە یەکەم لاپەڕەم کردەوە و یەکەم دێرم خوێندەوە، نوسرابوو: مەسیح دەفەرمووێ(پێغەمبەرێکی عەرەب لە دوای من دێ ناوی ئەحمەدە): خوایە گیان چەند میهرەبانی، چەند گەورەی، رینوێنیت کردم بۆ ئەوەی ئەمدەزانی! من کوڕی قەشەیەکم نکوولی و حاشا لە ئیسلام دەکات!! دکتۆر بەراستی چاوم فرمێسکی دەباراند کە ئەم وشانەم لەم منداڵە بچووکە گوێ لێ دەبوو.. موعجیزەیە لەم تەمەنە بچووکە خوا ڕێنوینی بکات من پێش بینیم نەدەکرد ئەو هەموو ولاتانە گەڕابێت لە پێناوی ئایینەکەی بەراستی گوێم لێ گرت ودەستم گوشیی وماچم کردو پێم گوت: بەراستی خوا خێر لەسەر دەستی ئەو دەنێرێت ئەگەر بیەوێ... پاشان منداڵەکە خوا حافیزی کرد.. ئەم ڕووخسارە پڕشنگدارە نورانییە لە بیر ناکەم، کەناوی لە خۆی نابوو

محەمەد.

بەباوکی محمدم گوت: بەڕاستی بەسەرهاتێکی سەیرە کاری تێکردم... بۆبینینی ئەم منداڵە پەرۆشت کردم... قسەکەم تەواو نەکرد، میواندارى فڕۆکە داوای کرد، جێگای خۆمان بگرین وانزیك بوینەوە لەفڕۆکەخانەی (شارل دیجۆل) ی نێودەوڵەتی لەپاریس. ئینجا لە جێگای خۆمدا دانیشتم ئەمەم دەگوتەوە کەخوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ... ﴿٥٦﴾﴾ (قصص)

واتە: ((ئەی محمد تۆ ناتوانی کەسێك خۆشت بویٚ هیدایەتی بدەی، بەڵام خوای گەورە ئەم کەسە هیدایەت دەدات کە خۆی بیەوێت.)) (ت: ناسان)

جارێك سەردانی باشووری ئەفریقام کرد، شێوەی مەحەمەدی بچووك لە ئەندێشەم دەخولایەوەو لە بیرم نەدەچوو، دەستم کرد بە سۆراغ کردنی، پێیان دەگوتم: ئەو لێرە بوو چۆتە شارێکی تر، بانگی خەڵك دەکا بۆ خوا.

هیوادارم ڕۆژێك بیبینم، ئایا ئێوەش حەز دەکەن بیبینن؟

# ﴿ لالێکی زمان پاراو ﴾

ئەو بەسەرهاتە سەرسورهێنەرە، ئەگەر خاوەنەکەی نەینووسیبایە باوەڕم نەدەکرد شتی وارووبدا، ئەو خەڵکی شاری مەدینەی پێغەمبەرە ﷺ : دەگێڕێتەوەو دەڵێ: گەنجێکم لەتەمەنی (٣٧)ساڵی خێزاندارم ومندالم هەیە، هەرچی تاوانی گەورە هەیە ئەنجامم داوە. نوێژم بە کۆمەڵ نەدەکرد، مەگەر لەبۆنەکان نەبێ بۆخەڵەتاندنی خەڵکی، هۆیەکەی برادەری خراپو بەدکاربوو، زۆربەی کاتەکان شەیتان لەگەڵم دابوو. کوڕێکی تەمەن (٧)ساڵی مەڕوانو بوو کەڕولاڵم هەبوو، بەشیری دایکە ئیماندارەکەی گەورە ببوو. شەوێك من ومەڕوانی کوڕم لەماڵەوە بووین، بیرم دەکردەوە نەخشەدابنێم کە لەگەڵ هاورێکانم چی بکەم و بچینە کوێ، کاتەکە دوای نوێژی شێوان بوو، لەم کاتە مەڕوان قسەی بۆدەکردم (بەهێمای بەینی خۆمان کە تێگ دەگەیشتین) دەیگوت: بۆ نوێژ ناکەی؟ئینجا دەستی بەرز دەکردەوە بەرەو ئاسمان، کەخوا دەمبینێ، چونکە هەندێك جار بەچاوی خۆی دەیدیت خراپەم دەکرد، لەقسەکەی سەرم سوڕما دەستی بەگریان کرد، بردمە لای خۆم بەلام هەلات، پاش کەمێك دەست نوێژی گرت، جاران چاکی نەدەزانی، دایکی فێری کردبوو، زۆر ئامۆژگاری دەکردم و سوودی نەبوو، هەموو قورئانی لەبەر بوو کوڕەکەم هاتەوە لام، ئاماژەی

بۆ کـردم کـەمێك چـاوەڕێ بکـەم...دیـتم دەسـتی بەنوێـژ کـرد، پاشـان چوقورئانی هێناو لەپێـشم دانـاو کردییـەوە، بـەبێ ئـەوەی لاپـەڕەکانی وەربگێڕێ، پەنجەی لەسەر ئەم ئایەتەی سورەتی مەریەم دانا: ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ﴿٤٥﴾﴾ (مريم) واتـە: ((ئەی باوکی بەڕێزم! بەڕاستی من دەترسم سزایەك لەلایـەن خـوای میهرەبانەوە یەخەت پێ بگرێـت، ئـەو کاتـە ئـیتر دەبیتـە یـارو یـاوەرو پشتگیری شەیتان.)) (ت: ئاسان)

دەستی بەگریان کرد، منـیش دەسـتم بـەگریانێکی درێـژ کـرد، هەسـتا فرمێسکی چاومی سڕییەوە، ئەوجا سەرو دەستی مـاچ کـردم، بـەئاماژە پێی گوتم: بابە نوێژ بکە پێش ئەوەی بچیە ناو خاك بکەویـە عـەزاب... سوێند بەخوای گەورە کەوتمە سەرسوڕمان وترسێك کەس نـایزانێ مەگـەر خوا، یەکسەر هەستامەوە گڵۆپەکانم داگیرساند، مـەروان ژوور دوای ژوور بەدوامەوە بوو بەنامۆیی سەیری دەکردم، گـوتی: واز لـە ڕوونـاکی بێنـە بابڕۆین بۆ مزگەوتی گەورە(مەبەستی مزگەوتی پیرۆزی پێغەمبەرﷺ بوو گوتم: نا دەچینە مزگەوتەکەی لای خۆمان نەخێری کردو داوای مزگەوتی پێغەمبەریﷺ کرد، بردمە وێ لەترسێکی زۆر گەورە دابووم چاوی قەت لەسەرم هەڵنەدەگرت... چوومە ناو ڕەوزەی پیرۆز، پڕ بوو لە خەڵك نوێژی شێوانیان دەست پێ کرد، پێش نوێژەکە گەیشتە ئەو ئایەتە ﴿ ❁

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾﴾ (النور)

واتــە: ((ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە، شوێنی هەنگاو و نەخشە و پیلانەکانی شەیتان مەکــەون، هەرکــەس شــوێنی هــەنگاو و نەخــشە و پیلانــەکانی شــەیتان بکــەوێت زەرەردەکــات، چــونکە بەڕاســتی شــەیتان هەمیشە فەرمان بە کارو کــردەوەی خــراپ و گونــاهو تــاوان و ناشــیرینی دەکاتن، ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوا نەبوایە لەســەرتان، ئــەوە هــەرگیز کەستان پاك و پوختەو ڕزگار نەدەبوون (لەدەست بوختانچیــەکان، یــاخود بەتەوبە پاك نەدەبوونەوە) بەڵام خوا هەرکەســێکی بوێــت و شایــستەبێت، پاکو پوختــەی دەکــات و لــە گوناهــەکانی دەبورێــت، خــوایش هەمیــشە بیسەرو زانایە (بە تەوبە و پەشیمانیتان و بە نیەتی دڵ و دەروونتان). (ت: ئاسان)

خۆم پێ ڕانەگیرا لە گریان و (مەڕوان) یش لە تەنیشتمەوە بە گریانی مــن ئــەویش دەســتی کــرد بــەگریان مــەڕوان دەســتە ســڕێکی دەرهێنــاو فرمێسکەکانی پێ سریەوە، پاش نوێژ تەواو بوون هەر دەگریام و ئــەویش فرمێسکی دەسڕیەوە تا سەعاتێك لەوێ ماینەوە، هــەتا مــەڕوان گــوتی: تەواو بوو باوکە، مەترسێ.... زۆر دەترسا لەبەر گریانی بــە کــوڵی مــن. گەڕاینەوە ماڵ، ئەو شەوە پیرۆزترین شەوی ژیانی من بوو. تێیدا تازە لە

دایك بوومــەوە. خێزانەکــەم هاتــە لامــان ولەگــەڵ منداڵــەکانم. هــەموو بەیەکەوە دەگریاین و ئەوان نەیاندەزانی مەسەلە چـییە، مــەڕوان پێیــانی گوت: باوکم لە مزگەوتی حەڕەم نوێــژی کــرد، خێزانەکــەم لەخۆشــی ئــەو هەواڵە خەریك بوو بفڕێ، کە ئەو منداڵە بــەری پــەروەردە جوانەکەیــەتی، بەسەر هاتەکەم بۆیــان گێڕایــەوە چــی روویــدا بــوو، بەخێزانەکــەم گــوت: سوێندت دەدەم بەخوا، ئایا تۆ فێرت کردبوو کە قورئان بکاتەوەو دەســت لەسەر ئەم ئایەتە دابنێ ؟ سێ جار سوێندی بە خــوا خــوارد، نــەو فێــری نەکردوە، پاشان گوتی: سوپاسی خوا دەکەم لەســەر ئــەم هیدایەتــەی تــۆ. ئەو شەوە خۆشترین شەوی ژیانم بوو، ئێستا ســوپاس بــۆ خــوا نوێــژ بــە کۆمەڵ لە مزگەوت نەبێ ناکەم وبرادەرە خراپەکانم هــەموو واز لێ هێنــا، تامی شیرینی ئیمانم چەشت... ئەگەر ببینی لە رووخــسارم ئەمــە بــەدی دەکەی، ئیستا لە ژیــانێکی پــڕ لــە بەختــەوەری و خۆشەویــستی و لێــك تێگەیشتن لەگەڵ هاوسەرەکەم و منداڵەکانم و بەتایبەتی مەڕوانی کوڕم کە کەڕو لاڵە و زۆرم خۆشدەوێ دەژیم، چۆن خۆشم نەوێ کــە هیدایــەتی مــن لەسەر دەستی ئەو بوو!.

# ﴿ تاکە گورچیلە ﴾

سەعات لە چواری بەرەبەیان نزیك دەبۆوە.. هەموو شتێك لە دەورو بەری بێ جوولە بوون، بێجگە لە گەلاکانی دارەکە شنە بای شەو دەیلەراندنەوە، لە نزیکی پەنجەرەکە شۆڕ ببوونەوە بە هێمنی و بێ دەنگی هەموو شتێکی داپۆشیبوو... لەناکاو زەنگی ئاگاداری کاتژمێرەکە لێیدا... ترررن.. تررررن.. تررر.. خەدیجە خێرا ئەو دەنگە هەراسانەی کپ کردەوە، سەر جێی بە جێگای هێشت بەرەو ئاودەست چوو.. ڕۆیشتنەکەی زۆر بەزەحمەت چونکە لە کۆتایی مانگی هەشتەمینی دوو گیانی دا بوو، سکی گەورە ببوو قاچەکانی ئاوسا بوو.. بەئاسانی ماندوو دەبوو هەناسەی بڕکێی گرتبوو ڕووخساری تێك چووبوو.. چاوی لەبەر گریان کز ببوو .. بەڵام بە ناچاری لەو کاتە هەڵدەستێ.. بانگی بەیانی تەنها یەك سەعاتی مابوو!! خەدیجە لە نزیکترین دەستە خوشکەکانم بوو، سێ ساڵ بوو مێردی کرد بوو، بێ گومان خۆی و مێردەکەی زۆر دڵخۆش بوون بە زگەکەی، بەڵام لەسەردانێکی بۆ لای دکتۆری پسپۆر و باش پشکنینی پێویست دکتۆرەکە پێی گوت: کچەکەی ناو سکت تەنها یەك گورچیلەی هەیە!! پاکی بۆ خوا ! نوژدارەکانی ڕۆژئاوا هەرچەندە لە زانست سەر کەوتوون، بەڵام تێبینی هەستی مرۆڤایەتی ناکەن، خەدیجەی

بەستەزمان توشی کۆستێکی گەورە بوو، کە زۆر بەخوێن ساردی پێی گوت: هیچ چارەسەرێکی خێرا نیە، مەگەر پاش لەدایك بوون پشکنینی منداڵەکە بکرێ بۆ دیاری کردنی تاکە گورچیلەکەی، ئەگەر لەبار نەبوو نەشتەرگەری گورچیلە چاندن ئاسان بووە، وەکو نەشتەرگەری لەوزەتێن!! خەدیجە لە بارێکی شپرزە دکتۆرەی بەجێ هێشت... نەیزانی چۆن گەیشتە ماڵەوە یەکەم منداڵەو یەك گورچیلەیە! چارەسەر چی یە؟ ئایا دەبێت دکتۆرەکە بەهەڵە دا نەچووبێ ؟ خۆی و مێردەکەی دەستیان بە گەڕان کرد، بە دوای باشترین نوژداری ئەم بوارە، بەڵام هەموو نوژدارەکان هەمان وەڵامیان هەبوو، یەك گورچیلەی هەیە، لەگەڵ هەر سەر دانێکی بۆ نوژدارەکان ئومێدی کەمترو بێ هێزتر دەبوو لە کۆتایی دا ملکەچی فەرمانەکە بوو کۆتا نوژدار پێی گوت: خۆت ماندوو مەکە بارەکە ناگۆڕێ... لەو کاتەوە خەدیجە تێگەیشت کە هیچ بەدەست خۆی نی یە بێجگە ڕوو لە خوا کردن و پاڕانەوە.. لەوێ ڕۆژێیەوە..کەسێ یەکی کۆتای شەو هەستێ و بپاڕێتەوە بۆ کچەکەی کە هێشتا نەببوو، چونکە خوای گەورە لە قورئان دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ (البقرە)

واتە: ((ئەی ﷺ) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێبکەن دەربارەم، ئەوە من

نزیکم لێیانەوە، بە هاناو هاواری دوعا گۆیانەوە دەچم هەر کاتێک لێم بپاڕێنەوەو نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بە من بهێنن، بۆ ئەوەی ڕێگای هوشیاری و ئاگایی بگرنەبەر (بۆ بەدەستهێنانی سەربەرزی و سەرفرازی هەردوو جیهان). (ت: ئاسان)

﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾﴾ (الانعام)

واتە: (((دڵنیابە لەوەی) ئەگەر خوا دووچاری زیان و گرفتێکت بکات، ئەوە هەرگیز لابەری نیە جگە خۆی نەبێت، خۆ ئەگەر بیەوێت تووشی خێرو خۆشیەکت بکات، ئەوە ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە)). (ت"ئاسان)

﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾﴾(يونس)

واتە: (((ئەی ئینسان) ئەگەر خوا تووشی ناخۆشی و زیانێکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت فریات بکەوێت و لەسەرتی لابەرێت جگە لەو زاتە، یاخود ئەگەر بیەوێت تووشی خێرو خۆشیەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەری فەزڵ و بەخششی خوا بگرێت، هەرکام کەبیەوێت لە بەندەکانی بەهرەوەر دەکات (لە نازو نیعمەتانی بێ شوماری) ئەو زاتە هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە)). (ت"ئاسان)

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾﴾ (غافر)

واتــە: ((ئەی خەڵکینە: پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێــوە هانــاو هــاوار بۆمن بهێنن، ئەوە من دوعاو نزاتان گیرا دەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگــەورە دادەنــێن ولــووت بــەرزی دەکــەن لەئاســتی پەرســتنی منــدا، لەئایندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتییەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە)). (ت"ئاسان)

هەروەها لەفەرموودەی پیرۆزی خۆشەویــست ﷺ هــاتووە ئــەبو هــورەیرە دەیگێرێتەوە کە خۆشەویــست ﷺ دەفــەرمووێت: ﴿ **ینــزل ربنــا تبــارك وتعالى كل ليلة الى السماء الدنيا، حين يبقى ثلث الليل الأخير فيقول : من يدعوني فأستجيب له، من يسألني فأعطيه، من يستغفرني فأغفر له !** ﴾ **رواه البخاري ومسلم.**

واتــە: ((خوای گەورە هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دنیــا، کــە ســێ یەکی کۆتــایی شــەو دەمێنــێ دەفــەرمووێ:{کــێ بــانگم دەکــا وەڵامــی بدەمەوە، کێ داوام لێ دەکا بیــدەمێ، کــێ تەوبــە دەکــات لێــی خــۆش بم})(.).

خەدیجە بۆی دەرکەوت کە هیچ پەنا گەیەك نیە تەنها خــوا نــەبێت، بۆیــە دوو دڵ نەبوو لە هەستانەوەی هەموو شەوێك پێش بەرەبەیان بە سەعاتێك یان زیاتر هەر چەندە هیلاك بوو لە دەســت ســکی و بــێ خــەوی: هــەموو

شەوێك لە سێیەکی کۆتایی شـەو دەچـووە سـەر بـەرماڵ و لەنوێـژەکانی کڕنۆشی ملکەچی دەبـردوو لـە خـوا دەپاڕایـەوە کـچێکی لـەش سـاغ و بەجووت گورچیلەی بـداتێ! زۆر سـوور بـوو لەسـەر داواکـەیی و دەگریـا تابەرماڵەکەی بەفرمێسك تەڕدەکرد، قەد ڕۆژێك بێئومێد نەدەبوو.. لاواز ببوو ڕکوع وکڕنۆش، لەسەری یەکجار گران بـوون، بـەڵام وازی نـەدەهێناو بۆجارێکیش کۆڵی نەدا هەر چەند جاری سەردانی نوژداری دەکرد ولەگـەڵ هەر پشکنینێك هەمان ئەنجامیان پێ دەدا، خەدیجە زیاتر سووربوو لەسەر شەوخونی و پاڕانەوەی کۆتایی شەو.هاوسەرەکەی دڵی پێ دەسووتا لەبـەر زۆر شەوخونی دەترسا لێـی کـە توشـی گرفتێـك ببێـت، لـەکاتی بـوونی کچەکەی بەتاکە گورچیلەیەك، هەردەم بـەبیری خـۆی دەهێنایـەوە خـوای گـەورە وەلاّم دانــەوە دوا دەخـات ئـەم فـەرمودەی پێغەمبـەری ﷺ بـۆ دەهێنایەوە: ﴿ **مامن مسلم يدعو بدعوة ليس فيها اثم ولا قطيعة رحم الا اعطاه الله بها احدى ثلاث:اما ان تعجل له دعوته، واما ان يدخرها له في الأخرة، واما ان يصرف عنه من السوء مثلها قالوا اذا نكثر قال الله اكثر﴾ الترمدي:٣٦٠٤**

واتـە: ((هەر موسڵمانێك بپاڕێتەوە، خراپـەو پەیوەنـدی پـچڕانی سـیلەی ڕەحمی تێدا نەبێت، ئەوە هەر خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەکات بەیـەکێك لەم سێیە: یان داواکەی پێش دەخات، یان دوای دەخات بۆ قیامەت، یـان خراپەیەکی لەسەرلادەبات،گوتیان: ئەگـەر زیـاتر داوا بکـەین.پێغەمبـەر

فەرموی: خواش زیاتری هەیە.))
هاوسەرەکەی بەبیری دەهێنایەوە کەوا هیچ چارەیەك نیە، مەگەر هەرلەخوا داوابکات، ئەی ئەگەر لەو داوا نەکات، لەکێ داوا بکات؟
شاعیر دەڵێت: لە ئادەمیزاد هیچ شت داوامەکە، بۆ چ داواناکەی لەو خوایەی هەرگیز دەرگای داناخات، ئەگەر لەخوا داوا نەکەی تورە دەبێ، ئەگەر لەخەڵك داوا بکەی توڕەدەبن چۆن داوا لەخوا ناکەی خۆشەویست ﷺ لەفەرمودەیەکی قودسی لەخوای پەروەردگار دەگێڕێتەوە:(ئەی بەندەکانم ئەگەر سەرەتایی وکۆتاییتان، مرۆڤ و جنۆکەتان، لەیەك کاتدا لێم بپاڕێنەوە، بۆ هەر یەکێکیان داخوازی جێ بە جێ بکەم، بەوەش هیچ لەوەی لەلامە کەم نابێتەوە، مەگەر بەقەد دەرزییەك کە لەدەریایەك بنرێ)
لەگێڕانەوەی موسلیم
پێش کاتی دیاریکراوی لەدایك بوونەکە دوو هەفتە، خەدیجە سەردانی کردم کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو، پێکەوە نوێژمان کرد، پێش هەستانمان، خەدیجە دەستی گرتم و پێی گوتم: هەست بەحاڵەتێکی نامۆ دەکەم . پێم گوت: هەست بەهیچ ئازار دەکەی؟ گوتی: نەخێر. بەڵام بۆ دڵنیابوونمان پەیوەندیمان بەدکتۆرە کرد، ئەویش گوتی: وەرنە لام. هەوڵماندا پەیوەندی بەمێردی خەدیجەوە بکەین، بەڵام بێ سوود بوو، چونکە لەنوێژی هەینی بوو.پشت بەخوا چووینە نەخۆشخانە سەرمان سوڕما گوتیان لەحاڵەتی منداڵ بوونە! لەتەنیشتی دانیشتم ویارمەتیم دا... سوپاس بۆ خوا زۆر

بەنزابوو هەرچەندە ئازاری زۆر بوو، بەڵام هەر لەخوا دەپاڕایەوە کچێکی لەش ساغ و خاوەن دوو گورچیلەی پێ بدات!!فاتمە لەدایك بوو قەبارەی بچووك... ڕووخساری ورد... ڕووی مەیلەو شین... لەپشتی ماکێکی بچووك بەرانبەر گورچیلەی هەبوو.

گریام و خەدیجە گریا لەناو فرمێسکەکانی لە کچەکەی دەپرسی.. بەچی وەڵام بدەمەوە؟! چ بەو دایکە بڵێم لەشەونخونی چاوی بەگریان وشك ببو وهێشتا ئازاری مابوو؟!! ماشاءألله جوانە ویستم قسەیەکی تر بکەم بەڵام قوڕگم گیرا، پاکی بۆ خوا چەند خولەکێکی نەبرد ڕەنگە شینەکەی بەرەو ڕەنگی پەمەیی گۆڕا، لەرووخساری فاتمە وردبوومەوە..پاکی بۆ بەدیهێنەر .. هەرچەند سەیری ڕوخساری جوانم دەکرد، ئەو گرفتەم بەبیر دەهاتەوە، کە بەهۆی یەك گورچیلەیی توشی دەبێ من وخەدیجە بەیەکەوە بێدەنگ بووین و بیرمان دەکردەوە داخۆ چارەنووسی کچۆڵەیەکی تاکە گورچیلە چۆن بێ؟ نوژدارەکانی منداڵان هاتن ودوا پشکنینیان بۆ کرد، گوتیان پێ دەچێ سروشتیە، بەڵام دەبێ پشکنینی وردی بۆ بکرێ بۆ زانینی توانای گورچیلەکەی و ئەوەش ناکرێ هەتا دووهەفتەی دیکە، خەدیجە زۆر دوودڵ بوو لەسەر بردنی فاتمەی ساوا بۆ پشکنینی ورد، ڕۆژێك پێی گوتم:(قەزاو قەدەری خوا چۆن بێ هەرئاوادەبێ، پێویست ناکا جەستە لاوازەکەی بەم پشکنینانە هیلاك بکەن). بەڵام دەستی لەهۆکارەکان بەرنەداو بڕیاری دا پشکنینەکانی بۆبکا، ڕۆژی دیاریکراو چووین لەپرسگەدا لەچاوەڕێی

دەرچوونی نوژدارەکە بوویین کەبێتە دەرێ لەبارەی تاکە گورچیلەکە هەواڵمان بداتێ..فاتمە پێویستی بەگورچیلەیەکی تازە هەیە یان تاکە گورچیلەکەی خۆی، دەتوانی کاری دوو گورچیلە بکات؟؟! نوژدارەکە بەزەردەخەنەوە هاتە دەرەوە، ڕووی لێمان کردوو گوتی: نازانم چی بڵێم ونازانم چی ڕوویداوە!لەبەڵام کچەکەت تەندروستی باشە، دوو گورچیلەی هەیە؟

گاڵتەت بەپاڕانەوە دێت ئایا نازانی پاڕانەوە چی کرد؟ دەرئەنجامی پاڕانەوە چەند جوانەو خوا چەند بەخشندەیە بۆ خەڵکی!ئێستاش فاتمە تەمەنی پێنج ساڵانە...خوا پاراستی، کردییە سۆمای چاوی دایکی وباوکی.

# ﴿ ئایـــدز ﴾

بەسەرهاتی گەنجێك خۆی دەیگێرێتەوە:

لــە ڕۆژێکــی ڕەشــدا لەیــەکێك لــە بازاڕەکــانی شــاری (خوبــەر)ی ڕۆژهەلاتی سعودیەدا لە قاوەخانەیەك دانیشتبووم‌و قــاوەم دەخــواردەوە، ڕۆژنامـەیەکی پەسەندی خۆم دەخوێندەوە، لەو کاتە کچێکی چـاو جـوان‌و سەرنج ڕاکێش لە لەش ولاری بە لارو لەنجە بە پێشم دا تێپەڕی، ســەرنجی دام بە سەرنجێکی قووڵی تینوو بۆ جوانی و ڕێك وپێکی بەبێ ویستی خـۆم هەستام دوای کەوتم، لەو کاتەدا چووە ناو دووکانەکان نەمتوانی بە دوایدا بچمە ژووری لە ترسی پیاوانی پۆلیس، نەك لە ترسی خوا (پەنا بـە خـوا) ئاوڕی لێ دامەوەو ئامــاژە ی کـرد، بـە دەســتە جـوان و ســپیەکەی کـە ڕازابۆوە بە ئەنگوستیلەو ئەڵماس بەبێ ویستی خۆم چوومە ناو دووکان بە شەرمەوە پێ ی گوتم: تکایە ژمارەکەتم بدێ، پێم گوت: و ئەویش لە سەر مۆبایلەکەی تۆماری کرد، ئەو مۆبایلەی لـەم ســەردەمەدا پەیـدا بـووە و توشی گرفتاری وئاژاوەی کردینە.

چەند سەعاتێك دواتر لە کۆتایی شەو پەیوەندی پێوە کـردم و دوای قسەی خۆش لە نێوانمان پێی گوتم: ئافرەتێکی بێوەژنەو کـارگێرەو خـاوەن سامانەو تەمەنی سی و یـەك ساڵە ئەگـەر ئـەوت بـدیبا وات دەزانـی هەژدە ساڵە.

پاش ئـەو قـسانە دەسـتمان بـە دانـانی کـاتی یـەکتر بیـنین کـرد،

لەسەرەتاوە لە خواردنگاكان وپاشان لە قاوەخانەكان، لە هەموو دیدارەكان نەمدەتوانی دەستیشی ماچ بكەم، بەوەش پەیوەستیم پێوە زیاتر بوو، لەبەر ئەوە لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئەوە پاكە ولەپێش من دۆستایەتی كەسی نەكردووە ونایەوێ كەسی دی بێجگە لەمن بناسێت، لەبەر ئەوە من لە چاوی ئەو گەنجێكی كۆك بووم و بەراستی زۆر جوان بووم.

رۆژێك تەلەفۆنی كرد وگوتی ئیشێكی گرینگم پێتە، پێم گوت: بەرفەرمانم گیانەكەم، گوتی دەمەوێ لە فلانە چێشتخانە، دوای سەعاتێك بتبینم گوتم: ئەگەر بەسەر ئاگریشدابێ دێم، (بەڵكو بەناو دۆزەخدا)... لە چێشتخانەكەی دا دەستمان بە قسە كرد، پێم گوت چیت لێم دەوێ گیانەكەم، لە جانتاكەی سەفەر نامەیەكی پلە یەكی بەناوی من دەرهێنا بۆ قاهیرە بوو، لەگەڵ مانەوەی (٣) رۆژ لە ئوتێلێكی (پێنج ئەستێرە)یی، هەروەها چەكێكی واژوو كراوی بەناوی من بەبڕی دە هەزار ریالی سعودی و پێی گوتم دەمەوێ دوو سبەی بچیتە قاهیرە، هەروەكو بۆت دیار كراوە بچیتە ئەو ئوتیلەی كەوا چاوەڕێتەوگیراوە، میوانخانەكە(دۆزەخ) لەوێ كەسێك هەیە بەناوی (...) ئەمەش ژمارەی تەلەفۆنەكەی (...) بۆ ئەوەی لەگەلی لە كۆمپانیای فلان و لە جیاتی من ئیمزای ئەو جل وبەرگانە بكەی كە لەپاریس دێت، و ئەمەش بریكار نامەی منە تكایە برۆ پێم گوت بەسەرچاو، ئینجا بەناخۆشی توانیم لە ئیشەكەم مۆڵەت وەرگرم ولەهەمان كاتی دیاری كراو چووم (خۆزگە ئەو گەشتەم نەكردبا).

پاش ئەوەی لە سەعات چواری عەسر گەیشتمە ئەوێ كەمێك

حەسامەوە، لەسەعات شەشی ئێوارە، مۆبایلەکەم دەرهێناو ژمارەکەم لێ دا (خۆزگە هەر داوام نەکردبا)دەزانن ئەو ژمارەیە کێ بوو؟ بێوەژنەکە خۆیبوو، پێم گوت فلانی؟ گوتی: بەڵێ خۆمم، دیارە سەرسام بووی خۆشەویستەکەم؟ گوتم: بەڵێ گوتی: وا دێم هەتا ئیشەکەت بۆ ڕوون بکەمەوە، پێی گوتم: وەرە خۆشەویستەکەم من هەر لەو هوتێلەدام لەژووری ژمارە(...) خێرا هەستام چووم و بە کراوەی چوومە ژوورەوە لە هەمان هوتێلە، دیتم بەرگێکی ڕووت و تەنکی لەبەر دابوو!کە بەڕاستی ورووژێنەر بوو هەر کەس بیدیتبایە خۆی پێ ڕانەدەگیرا، مەگەر کەسێك خوا بیپاراستبایە، دەستی لە ملم کردو دەستی بە ماچ و موچ کردو ورووژاندمی، خۆم لە بیر چوو مەست بووم، سەر جێم کرد بەڵکو زیناشم لەگەڵی کرد(پەنا بە خوا)بەو شێوەیە مۆڵەتەکەم دە ڕۆژبوو ڕامبوارد ئەو ماوەیە هەمووی لە لای بووم، پاشان بە یەکەوە بە فڕۆکەیەك لەشوێنی پلە یەك دانیشتین، گەڕاینەوە سعودیە، لەتەنیشت یەك دوور لە خوا هەر چەندخوا لەسەر سەرمان بوولوەکو ئەوە ی کە هەر هەست بەبوونی خواش نەکەین! بەو شێوەیە ماوەی ساڵێك بە یەکەوە ماینەوە، دەچوومە لای بۆ سەرجێی لە ماڵی خۆی، هەروەها ئەویش دەهاتە لای من لە شوقەی شارەکەی خۆم، شوقەکە لەو نەدەوەشایەوە، بەڵام بۆ جوانی و کۆکی من دەهات و بۆ خۆ تێرکردنی سێکسی خۆی بوو هیچیدی نەبوو...؟ ڕۆژێك خۆم و براکەم لە ڕیازی پایتەختی خۆشەویستمان بووین... قەزاو قەدەری خوا تووشی کارەساتێکی ئوتومبێلێ بووین، براکەم تووشی خوێن بەر بوون

بوو، منیش هیچم بەسەر نەهات! جگە لە چەند برینێکی سوکی بێ ئازار، خەڵکی لێمان کۆ بوونەوە، ڕێکخراوی مانگی سوور گەیشتە هانامان، ئێمەی گەیاندە نەخۆشخانەیەکی نزیك ئەوێ، براکەم هەر زوو برایە ژووری نەشتەرگەری، داوام لێ کرا خوێنی بدەمێ، چونکە خوێنمان هاوشێوەی یەك بوو، گووتم: بەسەرچاو چووینە ژووری خوێن وەرگرتن، پاشان بۆ پشکنین کەمێك خوێنیان لێ وەرگرتم، منیش زۆر دڵنیا بووم لە ساغیم، یارەکەم لەبیر نەبوو چەندان جار کاری سێکسیم لەگەڵی داکردووە! پاش پشکنینەکە دکتۆرەکە زۆر بە غەمباریەو هاتە لام گوتم: توخوا دکتۆر براکەم چیەتی توخوا پێم بڵێ! گوتی: کوڕم دەمەوێ پیاوێکی بڕواداربی بە قەزاو قەدەری خوا ڕازی بی! لەسەر سیسەمەکەم دابەزیم و گوتم: لەبەر چی براکەم مرد، هاوارم کرد براکەم مرد؟ گوتی: نەخێر. گوتم: ئەدی چی بووە؟ پزیشکەکە گوتی: خوێنەکەت پیس بووە بە ڤایرۆسی ئایدزی ترسناك (قسەکەی وەکو هەورە تریشقەبوو، خۆزگە زەوی شەق بایە تێیدا ڕوو بچوومایە)

کە ئەو قسەیەی کرد کەوتمە سەر زەوی و بێ هۆش بووم، پاش ئەوەی هۆشیار بوومەوە هەموو گیانم دەلەرزی، ئەرێ ڕاستە من تووشی ئەو دەردە کوشندەیە بوویمە!؟! ئەوە چەندە من وا بەو دەردەوەم،! پزیشکەکە گوتی: تۆ هێشتا نەخۆش نی بەلام هەڵگری ڤایرۆسەکەی وبەس، بەلام هەتا دەمری لەگەڵتدا دەمینێتەوە. (خوا پشتیوانە)، پاش دوو ڕۆژ براکەم بە ڕووداوەکە کۆچی دوایی کرد زۆر بۆێ دڵتەنگ وغەمبار بووم

چونکە هەربرا نەبوو بەس، بەڵکو هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم کە لەو بێوەژنە دوورکەومەوە لە(دۆستەکەم)، چونکە بەسەر هاتەکەم لەپێشتر بۆی گێڕابووەوە.. پاش دە ڕۆژ لەمردنی براکەم بێوەژنە کە پەیوەندی پێوە کردمەوە و

گوتی: ئەوە لە کێندەرێی خۆشەویستم لە مێژە دیار نی،

زۆر بە تورەیی گوتم: چیت دەوێ؟

گوتی: ئەوە چیتە؟

گوتم: براکەم بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل مرد ومنیش نیگەران ودڵتەنگم لەبەر ئەوەیە، گوتی: زیندوو لە مردوو باشترە، ئەی گوت خوا لێی خۆش بێت لەبەر دڵڕەقی.

گوتی: کەی بت بینم (ڕەچاوی هەستی نەکردم)

گوتم: لە مڕۆوە چیدی ناتبینمیەوە، گوتی لەبەر چی؟

پێم گوت: بەراشکاوی ئەمن تۆم خۆش دەوێ، نامەوێ توشی زیانت بکەم.

گوتی: چیتە؟

گوتم: ئەمن هەڵگری ڤایرۆسی نەخۆشی ئایدزم، توشی ئایدز بویمە!

گوتی: چۆنت زانی؟

گوتم: دوای ئەوەی لەگەڵ برام تووشی ڕووداوەکە بووین(خوا لێی خۆشبێ) بەسەر هاتەکەم بە تەواوی بۆ گێڕاوە

پێی گوتم: ئایا چویتە لای ئافرەتێکی تر بێجگە لە من؟

پێم گوت: نا...(راستیشم گوت)

ئایا هیچ جار لە ژیانت خوێنت وەرگرتووە

دیسان پێم گوت: نا

گوتی: کەواتە ئاواتەکەم هاتە دی.،

بە توڕەیی گوتم: مەبەستت چی یە؟

گوتی: دەمەوێ تۆڵەی لە هەموو ئەو گەنجانەی بووینە هۆکاری توش بوونم بکەمەوە، ئەوەش بزانە تۆ یەکەمیانی و ئەوانی دیش وەکو تۆ لە ڕێگان!!! پاشان تفی لێ کردوو تەلەفۆنەکەی داخست.

گوتم: خوا باشترین پشت وپەنایە لەسەرت ناچی ئەی ئافرەتی ئایدز، زۆر قسەی دیکە نامەوێ بیلێمەوە نەوەك هەستتان بریندار بکەم،ئێستا تەمەنم (٣٢) ساڵەو هێشتان ژنم نەهێناوەو توشی ئەو دەردە بویمە لەوەتەی(٢٩) ساڵی دایك باب و براکانم داوام لێ دەکەن ژن بێنم بەڵام ڕەتی دەکەمەوە، لەبەر ئەو دەردە، نامەوێ توشی هاوسەری ژیان و منداڵەکانم بکەم ئەوانیش نازانن، ئەمن لە هەموویان گەورەترم و براکەی خوا لێ خۆش بووم زۆر حەزی لە گەڕانەوەم دەکرد، بەڵام نەیدیت لە تەمەنی (٢٩)ساڵی سەری نایەوە و قسەی بابم وخەونەکەیم بەدی نەهێنا، ئیستاش بێزارو پەشۆکاوم لە ئاخەوە، پێش دەردەکە (٦٨) کیلۆ بووم و ئێستاش تەنها (٥٥) کیلۆم.. هەموو ئەو بێزاریە دەروونیەو خەونە ناخۆشانەیە لە ئەنجامی ئەو دەردە پیسەیە نازانم کەی لە ناوم دەبات، ئێستاش گەراومەتەوە بۆ لای خواو تۆبەم کردووە بەیەکجاری، پارێزگاری

لە نوێژەکانم دەکەم و دەستم بە دەرس ولەبەر کردنی قورئانی پیرۆز کردووە هەرچەندە درەنگە و کاتێکی زۆرم بەسەر چووە، ئیستاش وا ئەم پەیامەم ئاراستەی هەموو خوشك و برایانی موسڵمان دەکەم، دوور کەونەوە لەوەی خوا پێی ناخۆشە وەکو سەر جێی ناشەرعی(دامەێن پیسی)و کارو کردەوەی حەرام.

ئەوە ئامۆژگاری منە، لە رێگای لاپەڕەکانی ئینتەرنێت وبلاوکراوەکان ئاراستەی دەکەم و دەڵێم: بەڕاستی ژیان خۆشەو تامی شیرینە، بەلام بە لەش ساغی و تەندروستی یەوە، بەلام خوا پەرستی شیرینترە... نەك بەچەند ساتێکی سێکسی ناشەرعی ژیانت بە فیڕۆ بدەی، بەرەو دۆزەخ و خەونی ناخۆش، من ئەمڕۆ و هەموو رۆژێك تێدا دەژیم و خوا پشتیوانە ئەو بەسەرهاتەم بۆتان نوسی زۆر لێتان دەترسم، توشی ئەو نەخۆشیە پیسەبن، بۆیە تکاتان لێ دەکەم بەلە خوا نزیك بوونەوەی زیاترو پتەو کردنی بڕواتان، بۆ ئەوەی شەیتان لەخشتەتان نەبات بەرەو نارەوایی و چەپەڵی (پەنا بەخوا) نەتان بات. تکاتان لێدەکەم کەبۆم بپاڕێنەوە خوا شیفام بدات، خوا پاداشتی ئەو کەسە بداتەوە کە یارمەتی دام لەسەر بلاوکردنەوەی ئەم چیرۆکە بۆیەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرتن .

# ﴿ ئەو نوورەی ژیانی ڕووناك كردمەوە ﴾

گڵۆپی سوور پیَ یە.. ڕێگاکە پڕی ئوتومبێلە، کاتی دیاری کراوم چەند خولەکێك مابوو.. ئەو ڕاوەستانە چەند درێژە خۆزگا ئەم هێمایە بشکابایە.. خۆزگە لە پۆلی یەك بام.. چرکەکان بەهێواشی تێدەپەڕین وەکو دەقەو سەعات وابوون.. تەماشای سەعاتم دەکرد و تەماشای گڵۆپەکەم دەکرد.. دوایی گڵۆپی سەوز پیَ بوو.. دەستم خستە سەر هۆڕنی ئوتومبێلەکەم هەمووم هەراسان کردن.. ئۆتۆمبێلەکان جولەیان کرد.. یەکەمم بەجیَ هێشت.. خەریك بوو لەوی دی بدەم. بەڵێ بەلێخوڕینەکەم دەورو بەرم هەراسان کرد ویستم زوو بڕۆم.. بەڵام نەمتوانی.. کاتەکە تێپەڕی ودیدارەکەم بەسەر چوو.. کەسم لەبرادەرەکانم نەدی.. هەموویان ڕۆیشتبوون.. بۆ کویَ بچم.. سەرم سوڕما.. دڵە خورپەم گرت.. خۆزگە شوێنەکەم پیَ بزانیبا، سەیارەکەم بە هێواشی لێدەخوڕی.. هەربیرم دەکردەوە.. هۆڕنێك هوشیاری کردمەوە.. بەتوڕەیی تەماشای شوفێرەکەم کرد.. وبەدەستم ئاماژەم بۆ کرد.. لەسەر خۆبە خۆ دنیا نافڕێت هێواشبە و خێرایی خۆشم لەپێشتر لەبیر چوو..،

بڕیارمدا ئەمشەو لە ماڵەوە بمێنمەوە..، تەگبیرێکی باشە.. کچە تاقانەکەم نەخۆشە.. واباشە لێی نزیك بم.. لەپێش دوکانێکی ڤیدیۆ ڕامگرت.. دابەزیم لە دوکانەکە.. چەند فیلمێکم کڕی.. چومەوە ماڵیَ..

دەرگام کردەوە..بەهاوسەرەکەم گوت: چیاو چەرەزاتم بۆ نامادە بکە.. چوومە ژوورەکەم.. (ئۆی ژنێکی چەند جارسە).. ئێستا پێم دەڵێ(ئەحمەد لە خوا بترسە).. لەسەر ئەم قسانە ڕاهاتبووم، سۆزم بەرامبەری نەمابوو، هەر چەندە.. ژنێکی گوێ ڕایەڵە.. باشە.. هەوڵی بەختەوەری من دەدا.. بەچایی وچەرەزات هاتە ژورەوە.. بەڕوم پێکەنی و گوتی: لەبرادەرەکانت بێزار بووی، ئەمشەو دەتەوێ لە ماڵ دابیت.. گوتم: بەڵێ.. وەرە دانیشە..پێی خۆشبوو ویستی دابنیشێت..هەستام ڤیدیۆکەم پێ کرد..داماو وسەری داخست وگوتی: لەخوا بترسە ئەحمەد.. بەداخ وپەرۆشەوە دەرپەڕی.. دەنگی مۆسیقاو هاوارو پێکەنین لە هۆدەکەم بەرز بۆوە.. هەستام دەستم بە چایە خواردنەوەو خواردنی چەرەزات کرد.. چاوم تاریك ببوو لە دیار تەلەفزیۆنەکە..شریتی یەکەم تەواو.. شریتی دووەم، سەعات گەیشتە سێ ی نیوە شەو.. لە ناکاو.. دەسکی دەرگاکە بە هێدی جولاوە.. هاوارم کرد: چیت دەوێ؟.. هیچ وەلاّم نەبوو.. دەرگاکە کراوە.. کچە دەردە دارەکەم هاتە ژوورو توشی هەڵوێستی کردم.. حەپەسام قسەم نەکرد.. لێم نزیك بۆوە.. پێی گوتم: (بابە لە خوا بترسە..بابە لە خوابترسە..) ڕۆیشت ودەرگاکەی داخستەوە.. بانگم کرد ووەلاّمی نەداوە.. بەدوای دا چووم.. خەریك بوو باوەڕ نەکەم.. ئەرێ ئەوە کچەکەمە؟.. دەرگای ژوورەکەمم کردەوە.. دیتم لە باوەشی دایکی نوستبوو... ئەو خۆی بوو.. هاتمەوە ژووردکەم.. ڤیدیۆکەم کوژاندەوە..

دەنگی کچەکەم هۆدەکەی پڕ کردبوو.. (بابە لە خوا بترسە.. بابە لە خوا بترسە..) موچڕکێك بە گیانم دا هات.. ئارەقە بە نێوچەوانانم دا دەهاتە خوارێ..(هەرچەندە ژوورەکەم سارد بوو).. نازانم توشی چی بووم!.. وام لێ هات هەر گوێم لە قسەی ئەو دەبوو.. و هیچم نەدەدی تەنها شێوەی ئەو.. قسەکانی هەموو ئەو پەردانەی کە لەسەر دڵم کەوتبوو کە لە مێژبوو هەمووانی بڕی.. نوێژنەکردن.. تاوانی زۆر.. جگەرە کێشان.. فلیمی رووت... لە بێ ئاگایی ڕاپەڕاندم.. دڵەکوتەم خێرابوو.. کەوتمە سەر زەوی.. ویستم بنووم نەخەوتم بەڵکو نەمتوانی.. کات بە خێرایی تێپەری.. دیمەنەکانی ڕابردوو دەهاتنەوە بەر چاوم.. لەگەڵ هەر دیمەنێك، دەنگی کچەکەم گوێ لێ دەبوو:(بابە لەخوابترسە).. ئەوجا دەنگی بانگدان بەرز بۆوە.. ڕاچلەکیم.. هەموو گیانم لەرزی.. چوار پەلم کەوتە لەرزە..(ألصلاة خير من النوم)..، نوێژ لە نوستن چاکترە.. تۆی.. خۆمن ئەم هەموو ساڵە نوستبووم.. دەست نوێژم شوشت و بەرەو مزگەوت کەوتمە ڕێ.. لە ڕێگا وەکو نامۆیەك بووم.. هەر وەکو شنەی بەیان گلەییم لێ بکات کە بڵێ لە کوێ بووی؟..توومەز ئاسمان دەیان گوت: بەخێر بێی ئەو نوستووەی کە لە کۆتایی هەستای..چوومە ناو مزگەوت.. دووڕکات نوێژم کرد.. دانیشتم دەستم بەقورئان خوێندن کرد.. لەمێژبوو قورئانم نەخوێندبوو.. هەستم کرد قورئان دەمدوێنێ.. مژدەم دەداتێ.. دەمترسێنێ.. دەرگای گەڕانەوەو ڕزگاریم لەناگرلێ دەکاتەوە.. ﴿ ۞ قُلْ

يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ ... ﴿٥٣﴾ (الزمر)

واتــە: ((بڵێ بۆ ئەوانەی زیادەڕەویان کردوە لە خۆیان، با لە ڕەحمەتی خوا بێ نومێد نەبن، بەڕاستی خوای گەورە لەتاوانی تاوانباران دەبـووریٚ گەر بگەڕێنەوە)).(ت"ئاسان)

حەزم کرد لەخوێندن بەردەوام بم..بـەڵام بانگـدەر.. قامــەتی نوێـژی کرد.. لەشوێنی خـۆم سـڕبووم پاشـان لەگـەڵ خـەڵك پێـشکەوتم..لـەڕیز وەستام..وەکو نامۆ.. نوێژ تەواو بوو.. لەمزگەوت دانیشتم تا ڕۆژهـەڵات گەڕامەوە ماڵەوە.. دەرگای ژوورەکـەم کـردەوە.. سـەرنجێکی کـچەکەم و ژنەکەم دا.. هـەردووکیان نوسـتبوون.. بـەجێم هێـشتن و ڕۆیـشتم بـەرەو کارگە.. فێر نەببووم زوو بەرەو ئیش بڕۆم.. بەو زووە برادەرەکانم سەرییان سوڕما.. دەستیان بەدەستخۆشی وگاڵتە کرد.. گوێم پێ نەدان.. لـەدەرگا بەر چاوم تاریك بوو..چاوەڕێی هاتنی (ئیـبراهیم)م دەکـرد..بـرادەرم بـوو لەنوسینگە..وە زۆر ئامۆژگاری دەکردم.. بەڕاستی کەسێکی ڕەوشت جوان بوو.. ڕەفتاری جـوان بـوو.. ئیـبراهیم هـات.. لەشـوێنی خـۆم هەسـتام وپێشوازیم لێکرد..باوەڕی نەکرد.. گـوتی: تـۆ ئەحمـدی؟ گـوتم: بـەڵێ.. دەستیم گرت.. دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم.. گوتی: لە نوسـینگە قـسە دەکەین گوتم: نا.. دەچین بۆ پشوو، ئیـبراهیم بـێ دەنـگ بـوو گـوێی لـە قسەکانم گرت.. باسی ڕووداوەکەی دوێنێم بۆ کرد.. هەردوو چاوی پڕ بوون

لە فرمێسك و زەردەخەنەیەکی درێژی کرد.. پیٚ ی گوتم: ئـەو نـورەی کـە دڵی رووناك کردیەوە بە تاریکی گوناح مەیکوژێنەوە.. ئەو ڕۆژە پڕ بوو لە چـست و چـالاکی هـەر چـەندە لـە دوێنێـوە نەنوسـتبووم.. زەردەخەنـە ڕووخساری بەرنەدە دام .. لە کارەکە پسپۆڕ بـووم.. میوانـەکان دەهـاتن داوای هاوکارییان لیٚ دەکردم.. هەندێکیان دەیان گوت: ئەوە چی یە ئـەو هەموو چالاکی یە؟.. وەڵامم دانەوە ئەوە نوێژی بەیانیـە لـە مزگـەوت.. ئیبراهیمی داماو بارە گەورەکەی هەڵدەگرت و ئەمنیش هـەر دەنوسـتم.. هەرگیز گلـەیی و گازانـدەی لیٚ نـەدەکردم.. چ مرۆڤێکـە.. بـەڵیٚ ئـەوە بروایەکی تێکەڵاوی شیرینی ناخی دڵی بوو.. کاتەکە تێپەڕی وهەستم بـە بێزاری و ماندوبوون نەدەکرد.. ئیبراهیم گوتی: ئەحمەد پێویـستە بـچیەوە ماڵەوە چونکە لەدوێنێوە نەنووسـتووی ومـن کارەکـەت دەکـەم.. گـوتم: باشـە.. دەڕۆم.. تەماشـای سـەعاتم کـرد.. بـانگ دان کـەمی مـابوو.. نەڕۆیشتم.

بانگ درا بەخێرایی چوومە مزگەوت.. لە ڕیزی پێشەوە دانیـشتم.. هەستم بە پەشیمانی ڕۆژانی ڕابردوو کرد کە لە ئیش هەڵدەهاتم لـە کـاتی نوێژ ..پاش نوێژ چوومە ماڵەوە.. لە ڕێگا هەستم بە دڵـە ڕاوکـی کـرد.. ئەریٚ داخوا کچەکەم حاڵی چۆنە؟.. هەستم بە دڵ تەنگی کرد لەبەر چـی بوو نازانم، هەستم دەکرد ڕێگا درێژ بوو.. ترسم زیـاد بـوو.. سـەرم بـەرز کردەوە.. لە خوا پاڕامەوە کە کـچەکەم زوو چـاك بێتـەوە.. گەیـشتمەوە

ماڵەوە دەرگام کردەوە.. بانگی خێزانەکەم کرد.. وەلآم نەبوو.. چوومە ژوورەکە بە خێرایی.. خێزانەکەم هوشیار کردەوە.. بەگریانەوە هاواری کردو گوتی: کچەکەم مردوە.. تێنەگەیشتم.. چوومە سەر کچەکەم لە باوەش گرت.. دەستی بەربۆوە سەر زەوی.. لاشەی سارد بوو.. هەروەها دەست و پیێ ی و خورپەو هەناسەی نەمابوو.

هیچم گویێ لیێ نەبوو.. سەرنجی سیمایم دا.. نوورێك دەدرەوشایەوە.. وەکو ئەستێرەی درەوشاوە بوو.. بانگم کرد.. جولآندمەوە.. ڕامتەکاند.. دایکی هاواری کرد.. ئەوە مردووە.. کەوتە گریان.. فرمێسك وەکو ڕووبار لەچاوم دەهاتە خوار.. لە گوێم دەنگی کچەکەم دەزرینگایەوە.. {بابە لە خوا بترسیێ..} تەماشام کردەوە.. **﴿لاحول ولا قوة الا بالله.. انا لله وانا اليه راجعون..﴾** ئێمە هەر ئی خواین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە.. خێزانەکەم گوتی: خوایە گیان.. پاداشتم بدەوە دوا ڕۆژێکی چاکترم بدەوە.. بە تەلەفۆن پەیوەندییم بە ئیبراهیمەوە کرد و گوتم: ئێستا وەرە، کچەکەم مردووە.. ئەو زۆری لەگەڵ کێشام.. هەر دەیگوت: ئەحمەد هەتا کەنگی.. دەمگوت: سبەینیێ.. دەیگوت: بەلآم مردن لە ناکاو دێت.. خوای گەورە دەفەرمویێ [وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَـٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَـٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴿٢١﴾] (الطور)

واتە: ((جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و وەنەوەکانیشیان بە ئیمان و باوەڕەوە شوێنیان کەوتوون، ئەوانە لە بەهەشتدا پێك شاد دەکەینەوە (تا

کامەرانی و خۆشییان زیاتر بێت)، وەنەبێت ئەوانەی کە پلەی نزمتر، چونکە ئێمە پاداشتی کردەوەی کەس کەم ناکەینەوە (ئەگەر زیادی نەکەین) لە هەمان کاتدا هەرکەسە بارمتەی کردەوەی خۆیەتی)).(ت"ئاسان)

دایکی دەگریاو من دەگریام.. نوێژی مردوومان لەسەرکرد.. هەڵمان گرت بەرەو گۆڕستان ڕۆیشتین.. هەر چەندە تەماشای دارەبازەکەی دەکرد، هەر وەك تەماشای ئەو نوورە دەکەم کە ژیانی ڕووناك کردمەوە.. گەیشتینە گۆڕستان.. جێگاکەیەکی چۆڵە.. ترسناکە چووینە سەر گۆڕەکەی.. لەسەر ڕۆخی ڕاوەستام.. کچەکەم دەخەمە ناو ئێرە!.. ئیبراهیم شانی گرتم.. خۆڕاگربە ئەحمەد.. چوومە ناو گۆڕەکە.. ئەوە ماڵی تۆیە ئەحمەد.. لەوانەیە ئەمڕۆ لەوانەیە سبەی.. چیت ئامادە کردووەبۆ ئێرە.. ئیبراهیم بانگی کردم.. ئەحمەد کچەکەت بگرە.. وەرمگرت.. لەسەر تەنیشتی لای ڕاستی درێژم کرد و گوتم: بەناوی خوا.. لەسەر ئاینی پێغەمبەری خوا.. خشتەکانم ڕیز کرد..لەسەری کون بڕم کرد.. لە قەبرەکە هاتمە دەرێ.. خەڵکەکە خۆڵیان تێ کرد.. فرمێسکم بە دەست خۆم نەبوو.. ئەوە منم.. ئەو نوورەی ژیانی ڕووناك کردمەوە لەژێر گڵی دادەنێم.. پاکی و بێگەردی بۆ خوا.. بارودۆخ لە بارێکەوە بۆ بارێك دەگۆڕێ.

## « زیبکــــه »

خوشك و برایانی خواناس.. وایەکەم جـار بەسـەرهاتی ژیـانی خـۆم دەنووسمەوە، پێشتر ئەم نووسیوە لە ترسی پەیوەندی نیـوان خـۆم و خـوای گەورە وچاکەی لەگەڵم دا..پاش ئەوەی چەند چیرۆکێکم خوێنـدەوە گـوتم: بەڵکو بەسەرهاتی منیش بۆ خەڵکی ببێتـە مایـەی سـوود..ببـوورن لـە ئینتەرنێت ناسراو نیم، ئەوەندەم بەسە موسـڵمانێکم و کـەس نامناسـێ و ناشترسم لە پەیوەندیخۆم لەگەل خودادا، چونکە سوێند بەخوا ئەوەندە لە ژیانم ناترسێم لەوەی کە بـە فـیرۆ بـچێ لەگـەڵ خوا،خـوا پـەنام بـدا لـە گەڕانەوەم بۆ سەر گومڕایی پێشتر..ئەوەش بەسەر هاتەکەمە:

سوپاس بۆ خوا من ئافرەتێکم لە دایـك وبـاوکێکی دینـدار، ئیـستا تەمەن (٣٣) ساڵەم، بەسـەرهاتەکەم لـە کـاتی هـەرزەکاری دەسـت پـێ دەکا)، بەڕاستی گوناھ وسەرپێچی زۆرم کرد، کچی بچووکی ماڵەوە بـووم نازی زۆرم هەبوو گوناحی پێ ئەنجام بدەم، بەڵام سوپاس بۆ خوا نەك تاوانە گەورەکان، دۆستایەتی کوڕانیشم نـەدەکرد، هەرچـەندە دەمتـوانی، بـەڵام بەڕاستی بەدوای خۆشەویـستیەکی ڕاسـتەقینە دا دەگـەڕام، بەهاوسـەری کۆتایی بێت، هەروەکو ئەو فیلمانەی کە چەواشەمان دەکەن بە مەسـەلەی خۆشەویستی.

گرینگ ئەوەیە چوومە زانکۆ وتەواوم کرد، خوا جوانی و سیمایەکی دابوومێ پێش چاوبم، هەرچەندە داخوازیم دەهات بەڵام کەسیانم بەدڵ نەبوو، لەو کاتەدا زۆر بیرم لە خۆ پۆشین دەکردەوە هەستم دەکرد بە ترس وتاوانێك ئەوەکو بمرم، باوکم خوا لێی خۆش بێت زۆر نزای بۆ دەکردین کە باڵاپۆش بین و هەروەها دایکیشم، ساڵێك دوای دەرچوونم خوای گەورە حەجی بە قسمەت کردم وبڕیارم دا پاش حەج خۆم باڵاپۆش بکەم، ئێستا ئەو کاتانە لەبیر ناکەم بەڵێنم دا بەخوا باڵا پۆش لەبەر بکەم، لەو کاتە فرمێسك لە چاوەکانم دەهاتە خواریێ ولەگەڵ ناسوودەییەك،حەجم کرد کەهاتمەوە هەواڵی وەرگیرانم لەو بنکەیەکی من مەبەستم بوو پێم درا، بیرم کردەوە چۆن خۆم باڵاپۆش بکەم؟

چی لەبەر بکەم؟ چۆن ڕووبەڕووی کۆمەڵگایەکی نوێ ببمەوە، بە شێوەیەکی نوێ پێشتر لێی ڕانە هاتبووم لە ناو خەڵك و خزم ودۆستان؟ ئەوسا دەترسام پێی جوان نەبم، دیەنم ناشرین بێ ولێم نەوەشێتەوە پرسیار گەلێکی پوچ وخەیاڵاتێکی سادە رەنگە لەبەر لاوازی کەسایەتیم بێت بەڕاستی زیاتر لە خەڵك دەترسام نەك لە خوا، وەکو چیایەك کەوتە سەر دڵم و گفتەکەم لەگەڵ خوا شکاند، پێش چوونە سەر کار خۆم بەتەواوی ئامادە کرد و چەندان جل وبەرگی نوێم کڕی رەنگە پێتان سەیر بێت ئەگەر بڵێم ماوەی هەفتەیەك چوومە دەرەوەی وڵات بۆ کڕینی ئەم جلانە!!

سوێند بەخوای گەورە لەو بەرگانە هەندێکم هەر نەپۆشی کە بەم

دوایيه بەخشيم، هێشتا لەناو كارتۆنی خۆيان بوون، لەبەر ئەوەی خوای گەورە پێيان ڕازی نەبوو، بەرەكەتيان لێ هەڵگيرابوو ! كارە نوێيەكەم دەست پێ كردو بەبێ زيادەڕۆيی جێی سەرنجی هەمووان بووم، دڵخۆش بووم بەوەی هەموو گرينگيم پێ دەدەن، ترس و پەشيمانيم لە بەڵێن شكاندنەكەم بەرامبەر خوا نەبوو، نزيكەی سێ چوار مانگ بەسەر كارەكەم دا تێپەڕی و ڕۆژێك هەستم بە ئازارێكی زۆرو سوور هەڵگەڕانەوەيەكی زۆر كرد لەرووخسار، هەندێك زيبكە لەسەر رووخسارم پەيدا بوو، هەستام بە هەندێك دەرمان و پاككەرەوە دەم وچاوم شوشت، هەموو ئاواتم ئەوە بوو ئەم زيبكانە پاش يەك دوو ڕۆژ نەمێنن.. بەڵام نەك لەناو نەچوون بەڵكو زيادی كردو بەخوا سەرينەكەم پڕ لە خوێنی برينی زيبكەكان بوو..شتێكی سەير بوو لە ژيانم شتی وا ڕووی نەدابوو پێشتر يەك دوو زيبكە دەردەكەوتن و پاشان نەدەمان بەبێ ئەوەی شوێنی ديار بێ، بەڵام ئەو جارەيان لەناكاو لەشەو ڕۆژێكدا چەندان زيبكەی بەكێم و خوێن ڕووخسارميان شێواندبوو، هيچ شوێنێكی ساغ نەمابوو زيبكەی لێ پەيدا نەبێت.

بەخێرايی چوومە لای دكتۆر بەهەر حاڵ پاككەرەوەيەكی بۆ نووسيم، بەڵام سوودی نەبوو..ديسان سەردانم كردەوە چەند حەبی بۆ نووسيم هەر سوودی نەبوو..سەردانی دكتۆرێكی ترم كرد پاش چەندان پشكنينی پێويست بەهێزترين دەرمانی بۆ نووسيم كە بۆ زيبكەی لاوان بەكار

دەهـــات و هۆکارەکـــەی ئەنـــدامی نـــەبوو ببێتـــە تێکـــدانی ڕووخسارم،..دەرمانێکی بۆ نووسیم بۆ نەهێشتنی تەواوی چەوری لە لەش و بۆ ئافرەتی دوو گیان قەدەغە بوو، بەڵام سوودی نەبوو!. بەڵکو چوومە دکتۆرێکی دەرەوە لـە لەنـدەن پـاش پـشکنین گـوتی: چارەسـەرێکت بـۆ دەنووسم کە لەو چارەسەرە بەهێز تر نییە بۆ حاڵەتی تۆ، سەرنجم دا هەمان دەرمـانی پێـشوو بـوو سـوودی نـەبوو پـێم گـوت: بـەکارم هێنـاوە گوتی:بەداخەوە ئەمە بەهێزترین دەرمانە بۆ نەخۆش بنووسرێت و لە دوای ئەمە هیچم بەدەست نی یە .باری دەروونیم یەکجار شپرزە بوو..بە شەوان بە تەنیا دەگریام و خۆم نیشانی هیچ میوانێك نەدەدا نـەوەکو دڵیـان پـێم بسووتێ و بەڵکو خەم و پەژارەم لە چاوی دایکم و ماڵەوەمان دەخوێندەوە و بەڕاستی حەزم نەدەکرد لە ئاوێنـەش سـەیری خـۆم بکـەم و هـەموویان ڕێنماییان دەکردم بۆ چۆنیەتی چارەسەری، ئەوەش بووە هۆی زیـاد بـوونی بێزاری و بەدبەختیم ئەو هەموو زیبکەیە وای لە هەندێك ئـافرەت دەکـرد لە ماچ کردنیشم ڕابکەن لە ترسی توشبوونیان و ئەوەش بۆ دڵی من وەکو لێدانی چەقۆبوو. شەوێك لە شەوان.. خـوام بـەبیر هاتـەوە.. تێگەیـشتم هۆکارەکەی ئەو بەڵێن شکاندنەیە لەگەڵ خودادا دابـووم.. لەسـەر ئـەوەی دەترسام ئەگەر باڵا پۆش بم دەترسم پیێ ناشرین بم! بەڵام لـە پاشـان وەکـو ئەوەی کە خوای گەورە پەیامێکی بۆ ناردم و ..ئێستا خۆت چۆن دەبینی؟ پێشتر پێت ناخۆش بوو لە ئاوێنە سەیری خۆت بکەی لەبەر ناشیرینی ئایا

جوانی بەخششی خوا نی یە ئەوەی کە جوانی دروست کردوەو بەخشیوە ناتوانی بەچاو تروکانێك لەناوی ببات؟ ئینجا خوای گەورە ڕێنمای کردم بەرەو بەر فەرمانی خۆی ..خوا خاوەنی دەردو دەرمانە ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ۝﴾ (الشعراء)

واتە: ((کاتێکیش کە نەخۆش دەکەوم, ئەوە هەر ئەو چارەسەرم دەکات و شیفام بۆ دەنێرێت...)) (ت"ئاسان)

ئەگەر نەخۆش کەوتم هەر ئەو شیفا دەدا، سوێند بەخوا ئەوەی دەیڵێم ڕاستە دەستم کرد بە چارە سەری قورئان و بەسەردا خوێندنی ئاو و پێ شوشتنی دەم و چاوم، لێم دەخواردەوەو دەست نوێژم پێ دەشوشت بە نزای خۆشەویست ﷺ کە فێرمان دەکاو دەفەرموێ: ﴿ **اللهم اشف انت الشافي الكافي لا شفاء الا شفؤك شفاء لا يغادر سقماً**﴾.

وە هەروەها نزای: ﴿ **أعوذ على نفسي بكلمات الله التامة من كل شيطان وهامة وكل عين لامة**﴾ .. تەنیا پاش سێ ڕۆژ وبەس، بەو چارەسەرییە ئاگری ئازاری دەم و چاوم کوژایەوە، کەدەم وچاوی دەخواردم وگڕکانی کێم و برین وزیبکەکان هێور بونەوەو وەزیبکەو قینچکەکان بەرەو وشك بوون چوون سوپاس وستایش بۆخوا ئازار نەما. بڕیارم دا خۆم بپۆشم و لەکارکردن وازم هێنا، لەو مانگەدا قەدەری خوا وابوو، باوکم نەخۆش کەوت لەگەڵ ئەودا وبەماڵەوە چووینە دەرەوە بۆ چارەسەری، لەوێ خۆم داپۆشت وپۆشاکەکەم سادە بوو، واتە سەرپۆشم کرد لەگەڵ کراسێکی

درێــژ لەســەری زۆر سوپاســی خــوام کــرد. وپــاش ماوەیــەکی کــەم نەخۆشیەکەی باوکم گرانتر بووزانیمان نەخۆشـیەکی ترسـناکە، سـەرنجم دا باوکم لە پیاوێکی گەورەوە دەگۆڕێ بەرەو ئێسکە پەیکەرێکی لاواز.. ئەو دەنگە گەورەی کـە ماڵمـانی پڕدەکـرد ئێـستا بـەرەو خامۆشـی دەچـێت وبەچرپەو هەناسە سواری دەیـچرپاند.. تەماشـام کـرد کـە ئەگـەر مـرۆڤ ویستی خۆی بەهێز بکات هێدی هێدی چۆنی بەسـەر دێـت.. لـەو سـاوە ڕێگام بۆ ڕۆشن بـۆوەو ژیـانم گـۆڕا بڕیـارم دا کـەخۆم نامـادە بکـەم بـۆ پاشەڕۆژم.. ئایا هەموومان بەرەو ئەو پاشەڕۆژە بەخێرایی نـاڕۆین؟ بڕیـارم دا یەکەم کەس بم بگریم و دڵم بەخۆم بسوتێ، بۆئەوەی ئیشی لەسەر بکەم و خۆمی لەگەڵ بگونجێنم، چونکە جوانی و هێز و سامان دادم نادات بەبێ پەیوەست بوون بەخوای گەورە، پشتی پێ ببەستم بۆ لێقەومان و ڕۆژانـی تەنگ.

باوکم کۆچی دوایـی کـرد، خـوای لێ خـۆش بێـت، پـاش مردنـی گەڕاینــەوە ولاتــی خۆمــان، ئینجــا بەتــەواوی بــالاپۆش وعــەبام پۆشــی وبەیەقینــداری ومتمانــەوە نــەك وەکــو ئەوانــەی کەهــەزار حیــساب بــۆ دنیادەکەن دوا ڕۆژیشیان لەیاد نیە!من ئێـستا کەسـەیری ئاوێنـە دەکـەم شوێنی زیبکەکان لەدەم وچاوم دیـارە، بـەخوا خۆشەویـستە لەسـەر دڵـم، چونکە پەیامی خوا بوو بۆ من..ئەگەر ئەو زیبکانـە نـەبان ڕەنگـە ژیـانم نەگۆڕاباو هەر لەسەر کۆرە ڕێی هەڵەدا بمابامەوە. پێتـان بڵـێم بەڕاسـتی

پاش بالاپۆشیم بەسالێك، خوا دەرگای هاوسەرگیری لێکردمەوە وپاشان بەچەندان منداڵ کەئەوەش نیعمەتێکە لەخواوە مەسەلەکە بەجوانی و سیمانیە بەڵکو بەڕاستی بەو کردەوانەیە کەخوا ڕازی دەکاو بەرەکەت هەر لای خوایە، هەر خۆی ڕۆزی دەرە پاش ماوەیەك ئامادە دەبووم لەدەرسی ئایینی، خوا چاکەی لەگەڵ کردم ئێستا پێچە دەبەستم من ئێستا ئافرەتێکی بەختەوەرم لەسایەی خوای گەورە گەورەترین نیعمەتێکە کەخوای گەورە بۆمنی کرد، هیوادارم لێم نەسێنێتەوە وە داواکارم کەخوای گەورە ئەوە بکات لەگەڵ هەموو موسڵمانان وخوێنەران، دینەکەمان بپارێزی وکۆتایمان بە کردەوەی چاك بێ ولەسەر چاکە بمان مرێنێ ولێمان ڕازی بێت هەر خۆی بەخشندەو میهرەبانە..

ئـــــــامـــــــــــین.

# ﴿ کۆتاییەکی پڕخێر ﴾

کۆمەڵە گەنجێك لە یەکێك لە شەقامەکانی شارێك لەشارەکانی (خەلیج) لەسەر تاوان وخراپەکاری و گومڕایی کۆ بوبونەوە خەمیان هەر ئەوە بوو، هەر گەشتیارێك بەوێدا تێپەڕی... ئەگەر پێیان نەگیرابا سوکایەتیان پێ دەکرد، ئەگەر پێشیان بگیرابا تێر شەقیان دەکردو و بەنووکە چەقۆ ڕەوانەی نەخۆشخانەیان دەکرد، دەربارەی ماڵی خەڵك و سەیارەکانیان هەر مەپرسە! بەڵام کچی خەڵك کەس و کاریان لێ نەدەگەران دەربچن هەتاچەتەکان دەڕۆیشتن لەگەل ئەوەش چاوەڕێی کاتی بانگ دانیان دەکرد، بۆ ئەوەی بچنە مزگەوتی گەرەکەکە، نەك بۆنوێژ نەخێر بەڵکو بۆ فڕێ دانی پیسایی، پێڵاو بۆ نوێژخوێنان لە کاتی چەمانەوە و کڕنۆش بردنیان، بەڵکو هەتا میزیشیان پێ دا دەکردن، کەسیش نەیدەتوانی شکایەتیان لێ بکا؟ شەوێك لە شەوەکانی ڕەمەزان وەکو باویان بوو چوونە مزگەوتەکە بۆ نازاردانی خەڵك، لە ناو چەتەکان گەنجێك کە لە هەموویان ڕەشتر بوو(تاقانەی ماڵی خۆی بوو) کەلە هەمووان زۆردار ترو سەرەڕۆتربوو، بەتایبەتی لەو شەوە ئەم گەنجە فەرمانێکی سەیری دەرکرد کە جیاوازبوو لەگەڵ پێشتر... پێشنیازی کرد کە بچنە ناو مزگەوتەکە بۆ نوێژ کردن، جا ڕازی بوون و دەستنوێژیان هەڵگرت و نوێژیان کرد و ئینجا ویستیان بڕۆن ئەویشیان لەگەڵ بێ..

ڕەتی کردەوە.. پێی گوتن: ماوەیەکە نوێژم نەکردوە لێم گەڕێن من ئێستا ناسودەم دەمەوێ لە نوێژ بەردەوام بم، ئەوانیش بە جێیان هێشت ورۆیشتن، ئەویش هەر نوێژی دەکرد هەتا درەنگە شەوو تا کارمەندی مزگەوت هات کە دەیویست مزگەوت داخات، قسەی لەگەڵ کرد بەڵام سوودی نەبوو بەیەك وشەش وەڵامی نەداوە، کارمەندەکە وازی لێ هێناو لە دەرەوە دانیشت لەو کاتەدا باوکی گەنجەکە بەوێدا تێپەری وپرسیاری لێ کرد: هەرگیز پێشبینی نەدەکرد، کورەکەی لەوی بێ، بەڵام کارمەندەکە پێی گوت: کەسێك لەناو مزگەوتە وەکو ئەو پیناسەی دەکات بە کورەکەی دەچی، نایەوێ بێتە دەری، باوکی ڕایکردە ناو مزگەوتەکەو دیتی بەڕاستی کوڕەکەیەتی بە چاوی خۆی باوەڕی نەدەکرد توشی سەرسامی بوو، بەڵام زۆر دڵخۆش بوو پێکەوە چوونەوە ماڵ و کوڕوکە گۆیی شل کرد بۆ دایکی وباوکی گوتیان، ئەوان قەد بێ ئومید نەبوون لە دوعا کردن بۆی، بەڵام پاش ئەوەی کە تاقەتیان لێ بڕا لەوەی واز لە کارە خراپەکانی بینی، بەڵام لە ڕەحمەتی خولێبی ئومێد نەبوون: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ...﴿٥٦﴾﴾ (قصص)

واتە: ((ئەی ﷺ تۆ هیدایەتی ئەو کەسە نادەیت کە خۆشت بوویت، بەڵام خوای گەورە هیدایەتی ئەو کەسە دەدات کە بیەوێ.)) (ت:ئاسان)

ئەوجا داوای لێبوردنی لێ کردن وبەڵێنی دانێ کە باشتریش بێ،

ئەوەندە دڵخۆش بوون کە وەسفی ناکرێ وەکو ئەوەی تازە لە دایکـی ببـێ ئینجا دایکی وباوکی ماچ کردو داوای لی کردن کە لە شەو بانگی بکـەن بۆ نویژی بەیانی چووە سەر جێگاو نوست.

چەند سەعاتیکی نەبرد هەتا بانگ لە ئاسۆ دەنگی دایەوە، دایکی چوو بانگی بکا بەڵام.. هەناسەی نەمابوو.. گیانی لێ برا بوو(**لا الـە الا الله محمد رسول الله**،) بردیان بۆ مزگەوت تا بیشۆن وکۆمەڵە پیاویك کـۆ بوونەوە بۆ شووشتنی، کە ئاویان پێـداکرد دیتیـان ئاوەکـە ڕەشـیـەتیەکی دەباو دەتوێنێتەوە، مردوو شۆرەکان دەستیان بە {**الله اکبر**} کرد ئای ئەو پیستە ڕەشە بۆ واسپی بۆوە!! ئای ئەوە گوناحەکانی بوو یان ئەوە فریشتە دەیشۆن یان نزای دایکی وباوکی، کە هەرگیز ڕۆژیك لە ڕەحمەتی خوا بـێ نومید نەبوون، یان ئەوە ڕەحمەتی خوایە کە هەموو کەسێك دەگرێتەوە لـە موسڵمان و گاورو گـوی ڕایـەڵی و سـەر پێـچی؟ وا بـزانم ئـەوە هـەموو ئەوانەیە پێکەوە.

سوپاس و ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی کـە بەبـەزەیی ودلۆڤانـە، لەسەر بارەگا شکۆدارەکەی نووسراوە بەراستی ڕەحمەتی من بە پێش تـوڕە بوونم کەوتووە، دەبێ بەپێی توانا سوپاسی ئەو نیعمەتە بکەین کە تەمـەن هاوسەنگی پی ناکرێ.

# « ڕۆژانێك ژیانیان گۆریم »

زۆر دوو دڵ بووم پێش ئەوەی بەسەر هاتەكـەم بنێـرم بۆتـان، بـەڵام ویستم بە هەموو مرۆڤێك بڵێم دەیخوێنیتەوە، بەراسـتی نزیـك بوونـەوەی لەپەروەردگاری پێوەریكە بۆ گەرمی پێی دەزانی ڕێژەی دوورو نزیكی خۆی لەپەروەردگاری پێ دەناسی، بەسەرهاتەكەم لەو كاتە دەسـت پـێ دەكـات كەكچیكی بچووك بووم، باوكم سوڕەتە كورتەكانی بە دەنگی (شـیخ عبـد الباسط عبدالصمد) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) بۆی لێ دەدام، كە گـوێم لـە دەنگی دەگـرت دەگریـام، نەمـدەزانی لەبـەر چـی بـوو؟ هـەتا سـورەتە كورتەكانم تەنیا بە هۆی دەنگی ئەو لەبەر كرد، كە قورئانیشم دەخوێند بە هەمان شیوازی ئـەو دەمخوێنـدەوە، ڕۆژگارێكبـەم بـەم جـۆرە بەسـەرم دا تێپـەری، هـەتا گەیـشتمە تەمـەنی چـواردە سـاڵی ودەسـتم كـرد بـە دووركەوتنەوە لە پەروەردگارم هێدی بە هێدی، هەتا ئـەو ڕۆژە هـات كـە خوای گەورە ویستی یادم بخاتـەوە، چـونكە هـەر بـەخۆی توانـای بەسـەر هەموو شتیك دا هەیەو هەر خـۆی توانـای هەیـە كـە بـژیێنی وبمرێنـێ، لـەپۆلی سـێی ناوەنـدی بـووم لەگـەڵ سـەرەتای سـاڵ هـەواڵی مردنـی براگەورەكەمان پێ گەیشت، كەمن ودایكم باوكم لە ولاتیكی تر بوین، ئەم هەواڵە وەكو هەورە تریشقە بوو بۆم، بەڵام زۆر نەگریام دڵم ڕەق ببوو، ئەو

کاتە گوێم لـە قورئـان نـەدەگرت و نوێـژم نـەدەکرد، زۆر دوور بـووم لـە پەروەردگاری ئاسمان وزەوی، لەو کاتە گەڕاینـەوەی بـۆ خـاکی نیـشتیمان برایەکەم چووە ماڵی حەقیقی(گۆڕ) ئەوەش یەکـەم ڕۆژ بـوو کـە هاتـەوە (میصر) ولەو کاتەدا بالاپۆش بووم بەڵام جاران کە بۆ میصر دەهاتم یەکەم شت کە وازم لێ هێنـا بالاپۆشـەکەم بـوو، چـووینە زیـارەتی براکـەم لـە گۆڕستان لەوێ بەتەنیا گریام، هەموو شتێکم یاد کردەوە، ئەو ڕۆژە زانـیم کە هەموومان چارەنوسمان هەمان ئەم چـارە نووسـەیە، وئـەو کاتـە بـیرم کردەوە ئەگەر لە جێگای ئەوبام چیم دەکرد!چیم دەکرد ئەگەر لەسەر پردی (صراط) بڕۆیشتبام، ئەو ڕۆژە بۆ یەکەم جار زانیم مانای ڕێگای (صـراط) چییە، هەمان ڕۆژ بڕیاری بالاپۆشی و پەیڕەو کردنمدا، پاش چوونم بۆ کۆلیژ ناسیاریم لەگەل کۆمەڵە هاوڕێیەکی ڕێکوپێـك پەیـدا کـرد کـەمنیان لـە گـومڕایی گرتـەوە بـەرەو دیـارکردنی ئامـانج، لـەوان فێـری مانـای خۆشەویستی بۆ خوا بووم، مانای دڵسۆزی بۆکار، مانای گریـان لەترسـی خوای گەور. ئەوەی کە منیش لەسەر بەردەوام دەکـرد براکـەم بـوو، دوای خوای گەورە، داواکارم لەو خوایـە بەچـاکەی خـۆی هیدایـەتی دام بـەرەو ڕێگای ڕاست، هەمووان هیدایەت بدات پێش ئـەوەی ئـەو ڕۆژە بێـت کـە پەشیمانی داد نادات.

# ﴿ ویستی کچەکە گومڕا بکات ﴾

ڕابردوو چەند جوانەو هەروەها سەختو دژوارە، ئەمەش دوو سیفەتن لەیادوەری پیاوێکدا کۆبوونەتەوە، دوو سیفەتی دژ بەیەك هەوڵدەدەم یادی ڕابووردو بکەمەوە، بۆ ئەوەی بێتاوانی منداڵیەتیم تێدا ببینمەوە، هەوڵدەدەم لە بیرەوەری ئەو لەو بەدبەختیە ڕا بکەم و نەیبینمەوە کە لەهەرەتی گەنجیەتم تێدا ژیاوم، لەو کاتەی تەمەنم گەیشتە (١٥) ساڵ لە ململانی دا بووم، لەگەڵ دوو ڕێباز، ئەویش ڕێبازی چاکەو خراپە، بەڵام لە بەدبەختی خۆم ڕێبازی خراپەم گرتە بەر، کە شەیتان بە نرخترین دروشمی پێوە کردم وبوومە شوین کەوتەی، چەند ڕۆژی نەبرد پێش ئەو کەوتم بووە شوین کەوتەی من، ڕێچکەی تاوانم گرتە بەر، شەربەتی تاڵم لێ چەشت تاڵتر بوو لە تاڵی ژەقنە بووت، ڕۆژێك درێغیم نەکرد لە بەشداری کردنم لە لێك پچڕاندنی پەیوەندی پیاوەتی وڕەوشتە بەرزەکان، هەتا ناوم بووە هێمایبەدی وگومڕایی، جارێك ویستم سەرنجی کچێك بۆ خۆم ڕابکێشم کە خەڵکی گەرەك بوو، ئەویش زۆر دیقەتی دەدام بەسەرنجێك، کە نەمدەزانی مانای چی یە، بەڵام سەرنجی دڵداری ونەوین نەبوو، هەرچەندە دڵداریشم نەدەزانی، چونکە لەو کاتە سۆزم نەبوو، بەڵام سەرنجەکانی خەیاڵی تەنیم کە زۆر بیرم لێ دەکردەوە، هەتا وام لیهات داوای

هاوڕییەتی بکەم، پاشان چەند هەڵبەستێکم وەرگـرت کـە گوایـە شـیعری دڵداریە، کە لەدەرگای ماڵی خۆیانەوە بۆم نارد، بەڵام بێ وەڵام بوو، پـاش ئەوە بڕیارمدا دەبێ ئەو کچە هەڵبخەڵێنم، بە خۆشی یـان بەترشـی بـێ، شیعرێکم بۆی نووسی بەبێ ئەوەی ناوی دیار بکەم ئەویش ئـەو هەواڵـەی گەیشتێ و دەنگی نەکرد و هیچ شتێك لەلای نەهات، شەوێك کە سەعات چواری بەرەبـەیان بـوو دەهاتـەوە ماڵـەوە، دیـتم کتێبێکـی زیکرەکـانی پیغەمبـەری ﷺ لێ بـوو بـەوەش دەم وچـاوم سـوور هەڵگـەڕا وهـەموو ئارەزووە چەپەڵەکانی ناخم تووڕەتری کردم، تێگەیشتم ئەوەی کە نـاردوێتی کچەکە هەر خۆی بوو بەوەش جاری شەڕی لەگەڵ من داوە، بـیرم کـردەوە شیعرێك بنووسم لەسەر دڵداری من و ئەو و لە گەڕەکەکە بلاوی بکەمەوە بەوەش ئابڕوی ببەم، ئینجا دانیشتم وئەوەی شەیتان پێی خـۆش بـوو لـە شیعرەکە نووسیم، کەتەواوم کرد ناردم بۆ ماڵیان، هەڕەشـەم لێ کـرد کـە بلاوی دەکەمەوە لەناو ئەوانەی کە دەتناسن، نامەکەم لەگەڵ چەند دەنکە خورمایەك بۆم هاتەوە نامە گەیەنەرەکە گووتی: ئەمڕۆ کچەکە بـەڕۆژووەو خەریکە رۆژ و دەکاتەوە: ئەوە چەند دەنکە خورمایەکـە بـۆ تـۆم نـاردوە لەسەر ئەو شیعرەی بـۆت نـاردووم و لـە کـاتی رۆژوو شـکاندن لـە خـوا دەپاڕێمەوە کە هیدایەتت بدات، ئینجا خورمایەکانم وەرگرت و فڕێمدایـە سەر زەوی، لەخەفەتان چاوم سوور هەڵگەڕا، بەڵێنم دا تۆڵەی لێ بکەمەوە چ درەنگ چ زوو، لێنەگەڕیم لەسەر رێبازی چاکە بـێ هـەتا مـابێ، لـەو

کاتەی دەچووە مزگەوت، دەچوومە سەر ڕێگای، قسەی هیچ و پوچ وسووکم پێ دەگوت ئەو کچانەی کە لەگەڵی بوون، زۆر بەوە پێدەکەنین ئەویش خۆی تێك نەدەدا، هەر بەوەش ڕانەوەستام ڕۆژگارێك تێپەری کەمن سەر نەکەوتم لە گومرا کردنی، ئەویش بەردەوام بوو لە ناردنی نامیلکەی ئایینی بۆم، هەموو ڕۆژانی دووشەممە وپێنج شەممە کە بەرۆژو دەبوو، خورمای بۆ دەناردم، وەکو ئەوەی بەزمانی ڕەوان پێم بڵێ کەبەسەرتدا سەر کەوتووم، من هەر وا لە هەڵس وکەوتی تێ دەگەیشتم.

چەند مانگێکی پێ نەچوو سەفەرم کرد بۆ دەرەوەی وڵات بەدوای بەختەوەری ونارەزووەکانی دنیا لەوڵاتی خۆم نەمدی بوو، نزیکەی چوار مانگ لەوێ مامەوە، هەرچەند دووربووم بەڵام بیرم هەر بە کچەکەوە خەریك بوو، چۆن لەم هەموو پیلانانەی من بۆم دادەنا دەربازی بوو، بیرم کردەوە هەر کە گەڕامەوە وڵات دەست بکەمەوە بە پیلان بە شێوازێکی پیس وچەپەڵتر، بڕیارم دا لە ئایینی وەربگێڕم وبێتە سەر ڕێگای تاوان، ئینجا لەو کاتەی لە سەفەربۆ وڵات گەڕامەوە، ڕۆژی پێنج شەممە بوو کە لەو ڕۆژانە بەرۆژوو دەبوو، لەو کاتەی لەناوفڕۆکە بووم قاوەو خورمایان پێشکەش کردین، قاوەکەم وەرگرت و خواردمەوە وخورماکەم فڕێدا (کە نیشانە بوو بۆ ڕۆژوەوان و ئەوانی بیر دەخستمەوە)، فڕۆکە کە لە فڕۆکەخانە نیشتەوە، ئەو کات سەعات یەکی پاش نیوەڕۆ بوو، سواری تەکسیەك بووم بەرەو ماڵەوە وبرادەرەکانم لەو کاتە سەردانیان کردم،

هەریەك لەوانە دیاریـەکی لێـوەرگرتم هـەموویان شـتی بـێ سـوود بـوون لەهەموو ئەوانە گرانترو خراپتر تر ئەو دیاریە بوو کەلەبۆ کچەکەم دانابوو، بۆ ئەوەی بۆی بنێرم، نەمدەزانی پاش ئەوە چ دەکەم، دەرچووم بـۆ ئـەوەی کچەکە ببینم لەنزیکی مزگەوتەکە پێش نوێژی مەغریب، کـە مـوکرِ بـوو لەسەر ئەوەی نوێژەکانی لەمزگەوت بکات لەوێش کۆمەڵەیـەکی ئـافرەت هەبوو بۆ لەبەر کردنی قورئان، بانگی مەغریب دراو تـەواو بـوو نوێـژیش کرا کچەکەم نەدی، سەرم سوڕما، لەدڵی خۆمدا گوتم کچەکە ڕەنگە گـۆڕا بێت لـەکاتی سـەفەرەکەی مـن و وازی لەمزگـەوت هێنـابێ و دینەکـەی فەرامۆش کردبێت ئینجا گەڕامەوەماڵەوە، من هەموو ئـاواتم ئـەوە بـوو کەپێشبینیکەم لەجێی خـۆی بێـت ولـەو کاتـەی کتێبـەکانم هەڵـدەگێڕا، قورئـانێکم دیـت کەلەسـەری نوسـرابوو پێـشکەشت بێـت، بـەڵکو خـوا هیدایەتت بدات بەرەو ڕێگای ڕاست، بەئیمزاو ناوی کچەکە ئینجا لە خۆم دوورخستەوە لەکارەکەرەکەم پرسی کـێ ئـەم قورئانـەی بـۆ ئێـرە هێنـا؟ وەڵامـی نەدامـەوە، ڕۆژی دووەم چـوومەوە بـەر دەرگـای مزگـەوت وقورئانەکەشم پێ بوو، چاوەڕێم دەکـرد کـە بیدەمـەوەو پێـی بڵـێم: مـن پێویستیم بەوە نیە، وبەم نزیکانە تۆشی لێ دوور دەخەمەوە، چاوەڕێم کرد بەڵام نەهات؟ چەند ڕۆژ دووبارەم کردەوە سوودی نەبوو ئینجا چوومە نزیك ماڵیان لەمنداڵێکی بچووکم پرسی یارییان دەکرد لەگەڵ براکـانی پرسـیم: ئایا فلانە کەس لێرەیە؟

پێیان گوتم: لەبەرچی ئەم پرسیارە! ڕەنگە تۆ خەڵکی ئەم گەڕەکە نەبیت، گوتم بەڵێ بەڵام نامەیەکی دەستە خوشکیم پێ یە دەمەوێ بۆی ببەم، گوتیان ئەوەی تۆ لێی دەپرسی پێش دوومانگ لەکاتی نوێژ لە کڕنۆشدا کۆچی دوایی کرد، لەم کاتەدا نازانم تووشی چ هاتم ودنیا لەبەر چاوم دەسووڕا خەریك بوو بکەوم دڵم لێیداو فرمێسك بەچاومدا دەهاتە خوارێ ئەو چاوانەی کەزەمانێك بوو فرمێسکی پێدا نەهاتبوو فرمێسك بە کوڵ دادەباری، بەڵام بۆچی ئەم هەموو نیگەرانیە؟ ئایا لەبەر مردن و کۆتا پڕ خێرەکەیەتی یان لەبەر شتێکی دی؟ نەمتوانی ورد ببمەوە هۆکارەکەی بزانم و غەمباریە زۆرەکەم شی بکەمەوە، بە پێ بەرەو ماڵ گەڕامەوە پەشۆکابووم نەمدەزانی ڕووم بەرەو کوێیەو بەرەو کوێ دەڕۆم، دانیشتم لەدەرگام دەداو کلیلیشم پێ بوو، هەموو شتێکم لەبیر چوو بوو.

من کێم وام لێهات سەرنج بدەم و نیگاکانی کچەکە یاد بکەمەوە، لەهەموو جێگایەك لە دوام بوو، دواتر دڵنیا بووم کە نیگاکانی پیس نەبوون، هیچ شتێك نەبوو بێجگە لەنیگای سۆزو بەزەیی بۆمن، هەموو ئاواتی ئەوە بوو کە لەڕێگای تاوان دوورم بکاتەوە، پاش کۆچی ئەو، بڕیارم دا لەکەس وکارم دوورە پەرێزی بکەم، بەڕاستی لەکەس و کارو خەڵکی دوور کەوتمەوە، زیاتر لە ساڵێك دوور لە گەڕەکەکە نیشتەجێ بووم، ژیانم گۆڕا، وێنەی لەبەرچاوم بوو، لێم نەدەگەڕا هەتا لە تەنیایشم لەبەر چاوم بوو، کەدەچووە مزگەوت و دەهاتەوە، زۆر لەبرادەرەکانم

هەوڵیاندا هۆکاری دوورکەوتنەوەم و هەڵبژاردنی ژیانی تەنیایم بزانن، بەڵام پێم نەگوتن، ئەم قورئانەی پێشکەشی کردبووم هێشتا پێم بوو، وام لێهات کەماچی بکەم و بگریم و دەست بەجێ هەستم بۆ دەستنوێژ، بەڵام کەوتم و ڕاکشام هەرچەند هەوڵمدا هەستمەوە دەکەوتم، لەبەر ئەوەی بەدرێژایی تەمەنم نوێژم نەکردبوو، زۆرم هەوڵ دا خوا یارمەتی دام و بەناوی خوا دەستم پێکرد، نوزامەوەو گریام بۆخوا کە لێم ببورێ و ڕەحم بکا بەو کچە بەمیهری فراوانی خۆی، ئەو کچەی کە هەمیشە لە تێکۆشان بوو بۆ چاکسازی من و منیش هەوڵمدەدا بۆ گومڕا کردنی، بەڵام خۆزگەم دەخواست نەمردبا، بۆ ئەوەی لەسەر ڕێگای ڕاست ببینێ، بەڵام قەزاو قەدەری خوا گەڕانەوەی بۆنیە، وام لێهات هەمیشە لە خوا بپاڕێمەوە منیش کۆبکاتەوە لەگەڵ ئەو لە هەواری پڕ میهرەبانی خۆی و لەگەڵ ئەو زیندووم بکاتەوە لەگەڵ بەندە چاکەکانی.

# « سارا خانی شاجوان »

عەمر خالید: سلاوی خواتان لێ بێت براو خوشکانی موسلمان ئەم رووداوە بەسەرخۆمدا هاتووە، پێش سێ هەفتە لەسایتەکەم ئیمێلێکم بۆ هات، لە کچێك لە ئوسترالیا، لە ئیمێلەکەدا هاتووە: من کچێکی لوبنانیم لە باوکێکی موسلمان و دایکێکی مەسیحی، دەسالی تەمەنی بەراییم لە لوبنان ژیام پاشان دایك وباوکم کۆچیان کرد بەرەو ئوسترالیا، تاکو هیچ پەیوەندیەکم بەرۆژهەلاتی ناوەراست نەمێنێ لەم تەمەنە، ئێستاش تەمەنم (٢٢) سالانە، بەهاتنم بۆ ئوسترالیا هیچ پەیوەندیەکم بە ئایینەوە نەماوە، تەنها شتێك کە دەمزانی من موسلمانم، نازانم شێوەی قورئان و شێوەی سورەتی فاتیحە چۆنە، نوێژ و ئایین هیچ گرینگیەکی نەبوو لە ژیانم، پاشان باوکم لە ئوسترالیا لە دایکم جودا بۆوە، هەریەکە و هاوەسەرێکی دیکەیان بۆ خۆیان دەست نیشان کرد، تاکو چوومە زانکۆ و باوك و دایکم ئوسترالیایان بەجێ هێشت، بە بێ خانەوادە و برا بەجێیان هێشتم و هیچ دەربارەی باب و باپیرانم نازانم لە لوبنان، تەنیا ژیام پەنام برد بۆ کار، تاکو خۆم لە بیر بکەم، بەیانیان لە زانکۆ دەخوێند وئێوارانیش لە مەیخانە کارم دەکرد.

دۆستێکم هەبوو بە هەموو مانای رۆژئاوایی، هیچ تاوانێك نەبوو کە

بەبێ شەرمی وئازار ئەنجامم نەدابێ، بەڕاستی بە تەواوی رۆژئاوایی بـووم عەرەبیم بە شێوەیەکی ئاسایی نەدەزانی، لەبـەر ئـەوەی زۆر جـوان بـووم بەشداریم کرد لە پێشبڕکێی شاجوانی نیوزلەندا، سەر کەوتم لەو شارەی کە پێشبڕکێیەکەی تێدا ئەنجام درا، ئێستا ئامادەم بۆ پێـشبڕکێی گـەورە لـە نیوزلەندا، بوومە رێکلامی بەرگی گۆڤاری جل وبـەرگی ناشـەرعی، لـەو کاتە سەردانی خێزانێکی بە رەچەڵەك لوبنانیم کرد، کە نیشتەجێ بوون لە ئوستراليا، لەتەلەفزیۆن زنجیرەیەکی رەمەزانیم دیت کە باسی داوێن پـاکی دەکرد و ناونیشانی سایتە لەسەر نوسرا بوو، توشی داڕمانێکی زۆر بـووم، بەڕاستی ئەم زینجیرەیـە دەیدوانـدم، وا ئێـستاش بۆتـان دەنێـرم ولێتـان دەپرسم ئایا خوا لێم وەردەگرێ کە بگەڕێمەوە تەوبەبکەم؟

ئەم نامەیەم پێ گەیشت بەخۆم گوت: پاکی بۆخوا هەرچەندە دەروونـی مرۆڤ لەو پەڕی گومڕای دابێ، هەر شەیدایە بـۆ لای خـوای گـەورە وەکـو چۆن سك برسی بێ بۆ خۆراك گیانیش برسییە بۆلای خوا.

منیش وەڵامم داوە گوتم: هەڵبەتە خوای گـەورە تۆبـەت وەردەگرێـت (بێ گومان) رێنماییم کرد بۆ مەرجەکانی گەڕانەوە و تۆبەکردن، دوای دوو رۆژ پەیوەندی پێکردمەوە و وتی گەڕامەوە بۆلای خوا، وازم هێنـاوە لـە هاوڕێکەم لەمەودوا نایبینمەوە.

پاشان دوای دوو رۆژی تر پەیوەندی پێوە کردمەوە و گـوتی: دەمـەوێ فێری نوێژ بم، دوای دوو رۆژی تر گوتی: چەند کاسیەتێکی قورئانم دەوێ،

چەند کاسیەتێك بەدەنگی عجمی ومشاری راشد. وقورئانێکی مەدینەو هەموو زنجیرە کاسیەتەکانی خۆم بۆ نارد.

هەفتەیەك بێ دەنگ بوو، پاشان پەیوەندی کردوو گوتی: وازم لە نازناوی شاجوانی شارەکەم هێناوە.

پاشان لەدوای چوار ڕۆژ لەپڕ پەیوەندی پێوە کردم و گوتی: بالآم پۆشیوە.

بەلآم بەسەرهاتەکە هێشتا کۆتای نەهاتووە، دوای بالآپۆشی بەدوو ڕۆژ گوتی: هەستم بەئازارێکی زۆر کردووە چومە لای پزیشك پێی گوتم: تۆ توشی شێرپەنجەی دەماغ بووی و ڕۆژەکانیشت سنوردارە،

لەڕۆژی هەینی ئەم کچە گەنجە دەچێتە ژووری نەشتەرگەری بۆنوژدارییەکی بەپەلە لە مێشکی، کە ڕێژەی سەرکەوتنی لە (٢٠٪) زیاتر نیە هەروەکو پزیشکەکان دەڵێن.

ئەمە قسەی پزیشکەکان بوو، بەلآم کچەکە نامەیەکی ناردووە، کەس ناتوانێ بەم جۆرە ئەفراندنە بنوسێت، گوتی: من دلّخۆشم بەدیداری خوا، من دڵخۆشم تۆبەم کرد پێش ئەوەی بزانم کەنەخۆشم، من نازانم دایك وباوکم دەزانن کەچی بۆم ڕوویداوە یان نا، ئەوان پەیوەندیم پێوە ناکەن بەکەمی نەبێت، بەلآم من تەنهاسێ هەفتەیە گەڕاومەتەوە بۆلای خوا، پاش ئەوەی (٢٠) ساڵ سەرپێچیم بەرامبەر خوا کردوە، لەخوا بپاڕێنەوە بۆم کە لەڕیزی دانیشتوانی بەهەشت بمنووسێ، ئەگەر ژیاشم خزمەت بکەم

بە ئایینی ئیسلام لەرێی سایتەکەتانەوە، ئەم سایتە پەنجەرەیەك بوو بۆ من بۆ شارەزابوونم بەئیسلام.

پاکی بۆئەو خوایەی بەندەکانی هیدایەت دەدا ولێیان خۆشدەبێت تاکو رەحمیـان پێبکـات بـە میهـری فراوانـی خـۆی، نوزانـەوەی گوناهبـار خۆشەویستره لەلامان لەپاکانەی.

إنـا لله وإنـا إليـه راجعـون، خوایـە پاداشـتمان بدەییـەوە لەسـەر خۆشـیەکانمان، جێنـشینێکی باشـترمان بـۆ بنێـری لـەو، سـاری تەمـەن (٢٢)ساڵ مرد، نوێژی مردوویان لەسەر کرد لەو رۆژە نێـژرا لەگۆڕسـتانی موسلمانان لەنیوزلەندا، پەیامێکی کـورتی بۆنـاردم وتێیـدا گـوتی: مـن (٢٢)ساڵ لەدووری خوا ژیام بەڵام گەڕاومەتەوە بۆلای خوا،سـێ هەفتەیـە کە گەڕاومەتەوە بۆ لای خوا، بەشایەتبن وازیشم لەم هاوڕێیەم و کـارکردن لەمەیخانە و پێشبڕکێی شاجوانی هێناوە، وخۆم پۆشیوەو بەردەوامم لەسەر نوێژەکانم، بەشایەتتان دەگرم کەمن ئەمانەم هەمور لەپێناوی خوا کردووەو کەسیش ناناسم تەنیا ئێوە و ئەم سـایتە، جـا تکاتـان لێ دەکـەم کـەبۆم بپارێنەوە لەخوا ڕەحمم پێبکات و ببەخشێ، لەخوا بپارێنـەوە کـە دایکـم هیدایەت بدات کە هیچ دەربارەی من نازانێ.

تکاتان لێدەکەم هەوڵ بدەن بەپێی تواناتان، کردەوەی چـاکە بـۆ سـارا ئەنجام بدەن و بینێرن لە حەج وعومرەو خێرو نزا.

ئایا لەگەڵ من ڕەحمی خوا دەبینن، بەرامبـەر بەنـدەکانی کەلەسـەری

نوسراوە لەو كاتەدا دەبێ بمرێ، بەڵام خوا لەسەر خۆی رەحمـەتی نووسـیوە وای لێكرد كەبگەڕێتەوەو واز لە گوناهەكانی بێنێـت، تـەنها پـێش سـێ هەفتە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾﴾ (ق)

واتـە: (( بەڕاستی تا لەو بەسەرهاتانەدا یادەوەری هەیە بـۆ كەسـێك دڵێكی زیندووی هەبێت، یاخود گـوێ بـۆ قورئـان رادێرێـت، لەكاتێكـدا ئامادەبێـت بـۆ فەرمانبـەرداری و كردنـی هـەموو كـارێكی دروسـت.)) (ت"ئاسان)

**سـلاوی خـواتـان لـێ بـێـت خوشك و برایانی موسڵمان.**

# ﴿ دووری لە خوا ﴾

هەر لە گچکەییەوە دەستم بەئەنجامدانی هەندێك داب و نەریتی خراپکرد، پڕبوون لە سەرپێچی خوا، لەگەڵ ئەوەی دەمزانی ناڕەوایە وخوا پێی ڕازی نیە، بەڵام لە ئەنجامدانی و بەردەوامی لەسەری، قەدەغەیان نەدەکردم، هەموو جارێك سەرپێچی و تاوان پێیان وەدەدام و ویژدانمیان دەجولاند، بەڵام بەبێ ئەوەی بتوانم لێیان دووربکەومەوەو وازیان لێبێنم، وەجێی پێکەنینە کە من زۆر بە ئەدەب بووم لەهەڵس و کەوتم لەگەڵ خەڵکیدا، هەمیشە هەوڵمدەدا کە هەمووان دڵخۆش و ڕازی بکەم، وبەڵام ئەو حەزەم بۆ ڕازی کردنی خوا لەخۆم نەبوو، ئەویش بە بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی ودوورکەوتنەوە لە قەدەغەکانی، زۆر لە خوێندن و بە دەستهێنانی زانستم سەرکەوتوو بووم لەپلەی یەکەمەکان بووم، بەڵام بەبێ ئەوەی هەڵ بدەم لەیەکەمەکان بم لەگوێڕایەڵی لەخواو سووربم لەسەر سوننەتی خۆشەویستەکەی ﷺ، ئەوجا وای لەو سەرکەوتنە دونیاییەی کە لە سەرکەوتنێکی گرینگتر خەسارەت مەند بێ، سەرکەوتنی قیامەت و بەدەست هێنانی بەهەشت لا حول ولا قوة الا بالله، بەڵام گرفتی دووەم لە بەجێ گەیاندنی ئەرکە شەرعیەکان بوو،کە خوا فەرمانی کردبێ و پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری بەجێ گەیاندنی کردبێ، وەکو نوێژ لە مزگەوت و قورئان خویندن و شتی تر لە گوێ ڕایەڵی و خوا پەرستی، من بەجێم

دەگەیاندن و داوای پاداشتم لە خوا دەکرد، بەڵام نەك بە نیازێکی چاك بـۆ خوا، بەڵکو هەندێك نیازی تری لە پشتەوە بوو، وەکو بەخشین و لێ خۆش بوون و لەوانەش ڕازی کردنی دایـك و بـاوك و خـەڵکی دەورو بـەر، ئـەو نیازانەش دەبنە دوور خستنەوەی مرۆڤ لە نیازە بنەڕەتیەکان ئەویش وەکو لە خوا ترسان وگوێ رایەڵی راستەقینە بۆ خوا ئەوە خالێکی گـرینگ بـوو کە هەمیشە بەختەوەریم لەدەست دەدا گرینـگ تـرین شـت ئـەویش نوێـژ کردن بوو، سەرەڕای ئـەو هـەموو زانیاریـەی هـەمبوو دەربـارەی ئـەرکو گرینگی نوێژ و لە پایەی ئیسلام دا، بەڵام هێشتا جـێ بـەجێ کردنەکـەی هیچ بە شێوەیەکی پێویست نەبوو، بەبێ خشوع بەبێ پابەند بەکاتی دیاری کـراو وێـڕای بـەجێ نەگەیانـدنی لـە مزگـەوت...، لەزۆربـەی رۆژەکـان (بەتایبەتی لـە رۆژانـی کۆتـایی هەفتـە) هـەر لـە بەیانیـەوە تـا عیـشا دەنووستم، ئینجا کە هەڵدەستام هەموو نوێژەکانم پێکەوە دەگێراوە!! هێزو توانا هەر لە خواوەیـە، پەنابـە خـوا، دەفـەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝﴾ (الماعون)

واتـە: ((هاوارو ئازار بۆ ئەو نوێژکەرانەی کە لە نوێژەکانیان سست و کەمتەرخەمن)) (ت"ئاسان)

ئەوەش بۆ من واتـای شـتێکی زۆر گـەورە بـوو، ئـەو فـەرموودەی خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ: ﴿ لو علم الناس ما في الـصلاة العـشاء والفجر لأتوهما ولو حبوا ﴾

واتــە: (ئەگەر خەڵكی بزانن چ خێرێك لە نوێژی خەوتنان و بەیانیاندا هەیە، ئەگەر بە گاگۆڵەش با بۆی دەهاتن).

ئەوەش لە لای من مانای شتێكی ئەو تۆی نەبوو كە مــن ئەوانــەم دەبیست و دەخوێندەوە بەڵكو ناخی مردووی نەدەجولاًندم! لەسەر شێواوی پەشۆكاوی بووم، لە گومڕایی و نەفامی بــووم، زۆر لــە خــوا دوور بــووم، نەمدەتوانی دەستم بۆ پاڕانەوە هەڵبڕم، لە شەرمی ئەو هەموو تاوانەی كە دەمكرد،كە هیچ ڕۆژێك بە بیرم دانەدەهات كە ڕۆژێك بێت من وازیــان لیّ بێنم، لە نوێژ كردندا بە گرانی پێم دەكرا، دەشم زانی كە لەگەڵ سەرپێچی دیكە ڕوو بە ڕوو دەبمەوە ڕاستەوخۆ! سوێند بە خــوا ئــەوە بــیّ ئاگــایی و پەشۆكاوییە، ئەوە شەیتانی نەفرینە كە بۆ كاتێكیش وازم لیّ ناهێنیّ، بە ئــارەزووی خــۆی هەڵیدەســوڕاندم هــەتا وای لیّ كردبــووم لــە لیــستەی سەرپێچی تاوان یەك لە دوای یەك بكەم، جوڵەو هێز هەر لە خواوەیە.

لەگەڵ تیّ پەڕ بوونی ڕۆژگار وێڕای چوونە ناو قوناخی هەرزەكاریمو هەڕەتی لاوی، سەرپێچی و تاوانەكانم پەرەیان سەندو دەستم بە تەماشــای فیلمی ڕووت كرد، كە هەر هــەمووی هیلاكــی جەســتەیان بــەدواوە بــوو، دەستم كرد بە گوێگرتن لە هەموو جۆرە گۆرانیەك كەوا كێشەی و ســۆزو گیانی بە دواوە بوو، برادەرەكانم دەستێكی بالاّیان هەبوو بۆ ئاسان كردنی ئەم تاوانانە، هاوار لە دەست برادەری خراپ، بەخوا بە زۆر هەڵوێستدا تیّ دەپەڕیم كە نەمدەویست تاوانیّ بكەم، بەلاّم تووشــی دەبــووم هــەر لەبــەر

ئەوەی پێڕی ئەوان بووم !!

خـــــــــــــوایە هیدایەتی گەنجانی موسڵمان بدە.

بارو دۆخەكە وابوو كـە دەسـت بكـەم بـۆ گـەڕان بـەدوای ڕەگـەزی بەرامبەر، بەتایبەتی لەگەڵ ئەم هەموو شتانەی دەبینین لەم ڕۆژگارە خـوا پەنامان بدات لەم هەموو داڕمان و ڕووتی و دووری لـە پـاكی گیـان، بـۆ نموونە من دەگەڕام بۆ تەماشای كچ و ئافرەتان لە شاشـەی تەلـەفزیۆن بـە ئاسایی، لەبازاڕو كۆڵانەكان ڕەنگە ئەوەش ئاسـان نـەبێت بـۆ هـەمووان، بەڵام ئەوە ڕووی دەدا،هەرچەندە كچێك كە دەمدیت ڕووتتربا زیـاتر چـێژم لێ وەردەگرت، (پەنا بە خوا،) كە لەگەڵ هاوڕێكـانم سـەفەرم دەكـرد بـۆ دەرەوەی سعودیە، بۆ گەشت و گوزار یان كار زیاتر لە تاوان ڕوو دەچـووم، ئامادە دەبووم لە كۆڕی سەماكەران ئەوجا ژنم هێنا و هەموو ئاواتم ئـەوە بوو كە كەمێك بمگەڕێنێتەوە بەرەو خوا، بەڵام مخابن بە تەواوی پێچەوانەی ئەوە بوو، نامەوێ غەیبـەتی هاوسـەرە جودابووەكـەم بكـەم، سـێ سـاڵ لەگەڵی بووم، ئەوەی كە لـە دەسـتم دێ ئێـستا هـەر ئەوەیـە كـە داوای هیدایەتی بۆ بكەم، بەڵكو ئەوەی تەنها دەمویـست ئـەوە بـوو بـۆی ڕون بكەمەوە، كە ئەو ئەوەندە دەست بە ئیسلام گرتنەی هەمبوو، ئەویشی لێ بەفیڕۆ دام، بەتایبەتی لە پۆشاك و تێكەڵاوی، بەڕاسـتی گەیـشتینە ئـەو پەڕی دووری لە خوا.

لا حول ولا قوة الا بالله. کـە سـەردانی هەنـدێك خێزانمـان دەکـرد لەگەڵ ئەوان دادەنیشتین بەبێ پەردەو شەرم، وەکو ئەوەی خوشك وبرا بـین، بەیەکەوە دەچووینە کۆڕی سەماو لـەوێ بەیەکـەوە، لەبـەر چـاوی خـەڵك سەمامان دەکرد بەبێ ترس لەخوا! بـەبێ پـەردەو شـەرم، بـەرگی تەسـك وکورتی لەبەر دەکرد، ئایا دەبێ کەسێك ئـەوە بکـات، ئـەویش مـن بم؟! ئەو پرسیارە خەوی لێ دەتۆراندم، ژیانی تاڵ دەکردم، وەڵامەکـەی ئەگـەر من نەبم کێ یە، بەڵکو کەسێکی دی لە ناخمدا دەژیـا مـن بـەو شـێوەیە گۆش نەبووبووم، لەسەر ئەو بەدکاری و ئەو جۆرە ڕووتی و سفوری یە،کـە ئەمانەم ئەنجام دەدا، لەناخەوە هەستم بەنامۆی دەکـرد، هەسـتێك کـەس نەیدەزانی و چۆن و لەبەر چی وادەکەم، هەرکو ئەوەی لە خەون دابم و نەك واقعێکی تاڵ و خەجاڵەت بار، لەو کاتە هیچ دەسەڵاتم نەبوو، تەنها ئـەوە نەبێ کە لە دڵەوە نکوولی بکەم و وا نیـشان بـدەم، کـە مـن بەختـەوەرم لەگەڵ ژنە تەلاق دراوەکەم... بەڵام کێ منی ناچار کرد بوو لەسەر ئـەوە؟ بۆچی نەمدەتوانی بارەکەم بەرەو باشـتر بگـۆرم، بەڕاسـتی وەڵامـی ئـەوە تەنیا لە سێ وشە دایە(دووری لە خوا)بەڵێ ئەوە تەوەری بنەڕەتی بوو، کە بووە هۆی ئەو هەموو گرفتارییە، و ڕەنگە ئەوەش بەڕاستی زیاد بکەم کە ئەو ژنەی من پەیوەستی بووم، هەرگیز حەزی لـە هاوسـەرگیری نـەدەکرد بەڵکو هەر لە سەرەتاوە گوتی: کە بیر لە هاوسەری ناکاتـەوە لا حـول ولا قـوة الا بـالله. هـەروەها بێجگـە لـەو هـەموو سەرپێـچیەی دەمکـرد،

هەڵەیەکی دی ئــەوە بــوو کــە ئەویــشم فێــر دەکرد،ئــەویش ئــەو خاڵــەی قۆستبۆوە کە هەرچی بکا بکات، منیش نەتوانم ناچـاری بکــەم وازی لێ بێنێ، چاوم شۆڕ بوو،کە نەمدەتوانی واز لەو هەموو تاوانە بێنم، بۆئەوەی ئەویش ناچار بێ! بەڵکو ئەو شتانە خەوی لێ تاڵ کردبووم و لەسەر ئەوەش دەمدی هەموو شتێك دەکاو گاڵتەشی بەوانە دەهات کە پابەنـد بـوون بـە بالاپۆشی و پاکی(ئەو ئافرەتانەی کـە دینـدارن) سـێ سـاڵ ئـەو حاڵەتـە بەردەوام بوو، یەك دوو جار ویــستم تــەلاقی بــدەم، بــەلام هــەموو جـارێ هەڕەشەی خۆکوشتنی دەکرد، بەوەش تاوانەکەی لە ملی من دەبـوو، ئــەو دەیزانی کۆمەڵگا چۆن ڕەفتار لەگەڵ بێوەژن دەکات، ئــەویش نەیـدەتوانی بەرگەی بگرێ، منیش بە ناچاری وازم لە تەلاق دەهێناو لەترسـی ئــازاری ویژدان نەوەکو خۆی بکوژێ، ئەو حاڵە بەردەوام بوو، هەتا شتی تازە هاتە پێشەوە، لەوانەش بە نازناوی بەرەلا ڕازی بوو، هەر بۆ ئەوەی لەگـەڵ مـن بمێنێتەوە، هەرکە لەوە ئاگاداری کردمەوە یەکـسەر گـوتم: لەوەتــەی سـێ ساڵە حەز دەکەم، بەرەلام کرد بەبێ گوێ دانە ویژدان، پاش تەلاق دانەکەم ڕۆژانێك هات کە قۆناغی گۆڕان بوو، وام لێهات بە تەنیابم و قسە لەگـەڵ خۆمدا بکەم.. ئەو هەموو تاوانە چی بـوو کـە کـردم؟ بۆچـی دەمکـرد؟ بۆچی ژیانی هاوسەریم بەو جۆرە کۆتایی هات؟ هەموو جارێ وەلامەکـەی سێ وشە بوو(دووری لە خوا)، برادەرێکم هــەبوو کــە ناوەکــەیم لەبیرنییــە (خوا پاداشتی بداتەوە) لە ڕێگای پۆستی ئەلکترۆنییەوە ناوە ناوە هەندێك

فەرموودەی پێغەمبەرﷺ یـان ئامۆژگـاری و زیکـری بـۆ دەنـاردم، کـە دەمخوێندەوە هەستم بە شیرینیەك دەکرد، بەڵام لە هەمان کات هەستم بـە دڵ تەنگی دەکرد،لەبەر ئەوەی زۆر لێیانەوە دوور بـووم... ئـەوەش پـاش تەڵاق دانەکە بوو، پاش مۆڵـەتی هـاوینی گەرامـەوە مـاڵی خـۆم، دیـتم ماڵەکەم دزرا بوو، بەڵام سەیر بوو هەمووی نەدزرا بوو تەنیا ئەو شـتانەی کە بۆ گوناح بەکارم دەهێنا دزرا بوون، ئەریّ بەخوا، ئامێری سەتەلایت و ڤیدیۆو، و (ڕیکۆردەر ی گۆرانی لێدان،) و کامێرای تایبـەتی کۆمپیتـەر، ئەو چوار شتە کە هەمیشە گوناحم پیّ دەکرد، کە پێشتر دەمگوت: دەبـیّ پاش تەنیایی زیاتر بە کاریان بێنم، بەڵام هیچیان لە چـاوەڕێم نـەمابوون، کە دیتم زۆر تووڕە بووم و گوتم: دیسان دەیان کڕمـەوە، بـەڵام ئـەو کاتـە پارەم لەدەستدا نەبوو .

گوتم: ئێستا تا هەتا هەندیّ پارە کۆ دەکەمەوە، بیرم دەکـردەوە ئـەو ڕۆژگارە چۆن بیّ ئەو ئامێرانە؟... مانگی یەکـەمم ڕابـوارد، ڕۆژ بـە ڕۆژ هەستم دەکرد، کە من دەتوانم بەبیّ ئـەو ئامێرانـە بـژیم، کـە پێـشتر وام دەزانی کە هەرگیز ناتوانم، هێدی هێدی بیری کڕینەوەیان کەم بۆوە،

گوتم: تەلەفزیۆنێك وچەند کەناڵێکی ناوخۆم بەسـە کـە لـە سـعودیە هەیە، لەو سیّ مانگەی پاش تەڵاقەکە وێڕای بیّ ئـامێری تـاوان کـردن، گەیشتمە ئەو پەری کەم بوونەوەی تاوان، بەڵام بە هیچ جۆرێك هەوڵم نەدا گوێڕایەڵی خوا بکەم، هەرچەندە لە ناخی خۆم هەستم دەکرد کـە گـۆڕاوم،

لەو کەسەی کاتی هاوسەری و پێش هاوسەری.. ئەوەش لەو کاتە ڕوویدا کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە دیار تەلەفزیۆن کەناڵەکانم دەگۆڕی لە کەناڵی (إقرأ) بەرنامەی (دیداری دۆستان) لە پێشکەش کردنی مامۆستا عەمر خالیدم، دیت، باسی بەسەرهاتی یاوەرانی دەکرد وچۆن ئیمەش سوودو پەندی لێ وەربگرین، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ.. بەڕاستی شێوازەکەی هەست وهۆشی بینەرو ئامادەبووانی دەجولاند وگلەییەکی ڕاستەقینەی دەکرد، لەسەر ئەوەی کە ئێمە چەند لە شوێن کەوتنی پێغەمبەر و یارانی دوورکەوتینەوە... لەبەر ئەوە هەستێکی سەیر، دیتم بە پەرۆشەوە گوێی لێدەگرم وهەفتە بە هەفتە چاوەڕێی بکەم، بۆ ئەوەی بەرنامەی داهاتوو ببینم، گوێی بگرم لە چیرۆکی یاوەرانی پێغەمبەر ﷺ بە شێوازە سەرنج ڕاکێشەکەی عەمر خالد...، جا ڕەمەزان هات، ڕەمەزانی پیرۆز، ڕەمەزانی میهرو لێبوردن و ڕزگاری لە ئاگر، ئەوە کۆتا ڕووداو بوو کە منی گێڕاوە بەرەو خوا، کە مرۆڤی سەرپێچیکار تێدا مردووە، لە ئاخمدا شتێك هەبوو کە دەیویست تازە لە دایك ببێتەوە، چۆن ئەوە ڕوویدا؟ ئەو مستەکۆڵە بەهێزە چی بوو؟ کە تاوانەکانی پێ کوشت؟ ئەویش بەرنامەی (دیداری دۆستان) بوو کە مامۆستا عەمر خالد باسی یاوەرێکی دەکرد، لەو کاتەی کە یاوەرەکە گوێی لەم ئایەتە بوو دەستی بە گریان کرد: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ...(٧١)﴾(مریم). کەستان نیە مەگەر هەر

دەبێ بەسەر پردی (صراط) تێپەڕێ، کە پرسیار کرا لە هۆکاری گریانەکەی گوتی: بەراستی خوا پێمانی ڕاگەیاندوە، کە هەموو خەڵك ئاگر بە چاوی خۆیان لەسەر پردی (صراط) دەبینن، یاوەرەکەش لەوە دڵنیا نەبوو، ئایا لە پردی (صراط) دەپەڕێتەوە یان نا!! ئەی خوایە ئەو یاوەرە بەو هەموو کردەوە چاکەی کە دەیکا لە ترسی ئەوە دەگری نەوەك لە پردی صراط دەربازی نەبێ، وا ئێمەش لەو پەڕی دووری لە خواین تەنیا بۆ ساتێکیش بیر لە صراط نا کەینەوە، وەکو ئەوەی نەدەبینین و نە رۆژی قیامەت هەیە!! لێرە: مامۆستا عەمر گوتی: پێویستە هەموو کەسێك لە خۆی بپرسی ئایا ئەوەی کە من دەیکەم، ئیستا ئەوەی هەمە لە دنیا بەشمدەکات کە لە رۆژی قیامەت پێ لە پردی (صراط) دەرباز بم؟!

ئەو پردەی کە لە موو باریکترە ولە شیر تیژ ترە، ئەو پردەی کە پڕی قولابە... ئەو کاتەو تەنیا ئەو کاتە هەستم بە هەموو شتێك کرد ئەو پرسیارەم لە خۆم کرد ولآمەکەم بە سادەیی ئەوە بوو: نا.. نەخێر دەرباز نابیت لە پردی صراط بەو بارەی کە من لەسەری دەژیم و وێڕای ئەو هەموو سەر پێچی وتاوانانەی دەیکەم.

ئەو کاتە تێگەیشتم ڕاستی (دووریم لەخوا) لە دانیشتنەکەم ڕاپەریم لیرەدا شەرمەزارو خەجاڵەت بار بووم بە ئاگا هاتم، نابێ ئاگری دۆزەخ کۆتایم بێت پەنا بەخوا، خوا هۆشی داوم کە بیری پێ بکەمەوە، بۆ چی بەکاری نەهێنم بەو شیوەی یارمەتیم بدات کە لە پردی صراط پێی دەرباز

بم؟ یان بە لای کەم ئومیدم بـداتێ بـەوەی کـە بتـوانم، ئەوسـا بریـارم دا شیرینترین بڕیار لە ژیانم کە بڕیـاری تۆبـەو گەڕانـەوەم بـوو بـەرەو خـوا، هەستام نوێژ بکەم، پەشیمانی خۆم بـۆ خـوا دەربـڕی، پەشـیمانی لەسـەر ئەوەی کە کرد بووم، وتەرکی نەگەڕانەوەم بۆ سەر تاوان ئەوتاوانانـەی کـە پێوەست بووم و لەسەریان ڕا هاتبووم کە چەندان ساڵبوو، ئەو مرۆڤەی کە لەناخم دا بوو مرد، ئینجا مرۆڤێکی تازە لە دایك بوو مرۆڤێك کە هەموو ئاواتی ملکەچی بوو بۆ خوا، سەر پێچی نەکات وئاواتی سەرەتای گرینگی دەرباز بوون بوو لە پردی صراط وگەیشتنی بە ئازو نیعمەتەکانی بەهەشت

إنشاء الله... لەوێ دا کارێکی دیکە هانی دام وئازادی کردم ئەویش بەسەرهاتی یاوەرێکی دیکە بوو کە گوێم لێ بوو لە مامۆستا عەمر خالد (خـوا تەمـەنی درێـژکات) ئـەویش باسـی (ذوالجوشـن الـضباب)ی بـوو، پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: ئایا دەتەوێت لەگەڵ پێشینەکان بی لەگەڵ ئێمە ئەو کاتە هێشتا سەرەتای بانگەوازی ئیسلام بوو. ئەویش ڕەتـی کـردەوە، پاش ساڵانێکی درێژ کە مەککە رزگار کرا ذوالجوشن موسڵمان بوو، ئەوجا پەشیمان بوویەوە چۆن لەسەرەتاوە موسڵمان نەبوو کە دەرفەتیشی هەبوو لە سەرەتا بێ بەش بوو، ئەو بەسەرهاتە وانەیەکمان فێر دەکات کە مـرۆڤ دەبێ پێش برکێ بکات بۆ گەڕانەوە بۆ لای خوا تا لـە پیـشینەکان بێـت، منیش لە فێربوونی زانست لە یەکەمەکان بووم، ئیـستاش ئـەو دەرفەتـە هاتۆتە پێش کە لەیەکەمە گەڕاوەکان بم، لـە نـاو گـەنجانی خیزانەکـەم و

برادەرەکانم سوپاس بۆ خوا، لە خوا دەپاڕێمەوە کە خوشك وبرایانی موسڵمان وگەنجان بەرەو ڕێی هیدایەت ببا... لەو کاتەوە هەموو شت گۆڕاو ژیانم بە تەواوی گۆڕا، یەکەم جار هەستم بە شیرینی ژیان کرد، شیرینیەکی ئەو تۆ کە پێشتر هەرگیز تامم نەچێشتبوو، هەستم بە پاکی کرد، هەستم بە مانای خۆشەویستی خواو پێغەمبەر ﷺ کردو ئەوەش هەمووی بە شوێن کەوتنی فەرمانەکانی خوا ودورکەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکان بوو، وام لێهاتن لە گێرە شێوێنی وسەرسورماوی ژیان دەرباز بم، بەڵکو ئەوە گۆڕا بە یەقینداری ودامەزراوی کە (٢٦)ساڵبوو تیدا دەژیام، جارێك لە جاران یەك فرمێسکم نەڕشتبوو لە ترسی خوا، لە خۆم دەپرسی: ئەری ئەو خەڵکە چۆن وا بە کوڵ دەگرین، کە گوێیان لە نزایەك یان قورئان خوێندن دەبێت؟ بە خۆڕایی هەوڵم دەدا کە چەند فرمیسکێك بڕێژم بۆ ئەوەی منیش هەست بکەم، وەکو ئەم خەڵکەم بەڵام سوودی نەبوو، بەڵام پاش ئەوەی گەڕامەوە بەرەو خواو پەیوەست بووم، پێی دەرباز بووم لە سەرپێچیەکانم وام لیّ هاتووە، هەموو رۆژێك چاوەکانم فرمێسك دادەبارینن، لەو کاتەی قورئان دەخوینم، یان گوێی لیّ دەگرم یان نزایەك بە دەنگێکی خۆش دەبیستم، تێگەیشتم کە فرمێسك دادەباریّ، مرۆڤ هەستی پیّ ناکاو بەدەست خۆی نیە، شیرینی دڵۆپی فرمێسك لە ترسی خوا بە وشە پێناسە ناکریّ، ئێستاش لەبیرمە یەکەم جار فرمێسکم هاتە خوارەوە، ئەویش لەشەو نوێژ دابوو، لەشەوەکانی کۆتایی بوو لە کاتی

پاڕانەوەی قنوت لەگەڵ پێش نوێژێك، دەنگی یەکجار خۆش بوو، بەخۆم باوەڕ نەکرد لەوساتەدا بەدرێژایی تەمەنم چاوەڕێم دەکرد بۆ لای خـوا، وای لێهات دڵۆپی فرمێسك لەهەموو کاریك پترو شیرینتر بێت لەلام، نزیکـەی هەموو ڕۆژێك بەسەرم دادەهـاتن، ئێـستاش پـاش تێپـەڕبوونی ڕەمـەزان مانگ ونیوێـك لـە ڕەمـەزان، کاروبـارێکی زۆر لەچـاکە فێربوومـە کـە هیوادارم خەڵکیش پێیان بزانێت تا چـێژ لـە ژیـان بکـەن و پـاك ببنـەوە لـــەتاوان، بـــەگوێرەی فـــەرمانی خـــوا: ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾﴾(الـضحى) لەسەرمە بەخششەکانی باس بکەم لێرەدا باسی چەند کارو تاعەتێك دەکەم کەفێربوومەو لەسەری بەردەوامم، هیوادارم خوێنـەرانیش بیکەن و تاقی بکەنەوە، بەتایبـەتی پـاش ئـەوەی لەتاوانانـە گەڕامـەوە، کەچـۆن مـرۆڤ بەسـەر خۆیـدا سـەر دەکـەوێ، تاوانـەکانی بەگوێڕایـەڵی دەگۆڕی، ئەگەر بەتەواوی بەڵێن بدات... مـن ئێـستا هـەموو نوێـژەکانم لەمزگەوت لەکاتی خۆی دەکەم، بەتایبەتی نوێژی بەیانی، کـە بەدرێـژایی (٢٦) ساڵی تەمەنم، بێجگە لەچەند جارێك کە لە پەنجەی دەست تێناپەڕێ ئەنجامم نـەداوە، داوای بەخـشین لـە خـوا دەکـەم، قورئـان بەبـەردەوامی دەخوێنم، پێشتر نەم کردەوە مەگەر لەڕەمەزان نەبێ، ساڵ بەسـاڵ قورئـانم نەدەخوێند: لاحول ولا قوة الا باالله، سونەتەکان بەزۆری جێ بەجێ دەکەم، بەتایبەتی نوێژە سونەتەکان، کەپێشتر لەژیانم نەمکردبوو، زۆر زیکری خوا دەکەم تەسبیح وإستغفار، بۆ ئەوەی زمان هەمیشە تەڕبێ بـەزیکری خـوا

دڵیش ئاسوودە بێ، کاسێتە بێ سوودەکانم کەگۆڕانی بوون گۆڕیمەوە، بەوتاری ئاینی و زانستی، سەیری ئافرەتان ناکەم چ بە ئاسایی ولەتەلەفزیۆن چاو پاراستنم بۆتە شیرینترین خوا پەرستی، کەهەمیشە چاوم دەپارێزم و زۆر چاکەی تر سوپاس بۆ خوا، ئایە بەو جۆرە کە دەیبینی براو خوشکی موسڵمان بەردەوام بووم، بەراستی مرۆڤ ئەگەر بیەوێ بەسەر ئارەزووەکانی دا زاڵ بێت و هۆشی بەکار بێنێ ئەوە دەتوانێ واز لە هەموو سەر پێچی وتاوانەکانی بێنێ، هەرچەندە زۆر بێت ولەسەری ڕا هاتبێ، سوێند بە خوای بێ هاوتا شیرینی تۆبە و خوا پەرستی هیچ شیرینیەك نایگاتێ، خوا پشت و پەنای هەرکەسێك دەبێ، بەڕاستی بۆ لای بگەڕێتەوە.

راستیش بۆ قسەکەم ئەو فەرموودەیەیە: ﴿**من تقرب الى شبرا، تقربت اليه ذراعا، ومن تقرب الى ذراعا، تقربت اليه باعا، ومن اتاني مشيا، اتيته هرولة، ولا يزال العبد يتقرب الي بالنوافل حتى احبه، فان احببته كنت بصره الذي يبصر به، وسمعه الذي يسمع به،..الى اخر الحديث**﴾. ئەمەش فەرموودەیەکی قودسی یە.

واتە: ((هەر کەسێك بستێك لێم نزیك بێتەوە من باڵێك لێی نزیك دەبمەوە هەرکەسێك باڵێك لێم نزیك بێتەوە من شا باڵێك لێی نزیك دەبمەوە، وهەرکەسێك بە ڕۆیشتن بۆم بێت، من بە خۆش ڕۆیشتن بۆی دەچم، و بەندەکانم بەو جۆرە لێم نزیك دەبنەوە بە سونەتەکان هەتا خۆشم

دەوێت، کە خۆشم ویست دەبمە ئەو چاوەی کە پێی دەبینی، وئەو گوێیەی کە پێی دەبیستێ...هتد))

ئەرێ دیتان خوشك وبرایان چۆن خوا کەیف خۆش دەبێ وبە گەڕانەوەی یارمەتی دەدا بە زیاتر نزیك بوونەوەی؟ هەتاکەنگی؟ هەتا کەی ناتوانی واز لە گوناح بێنی؟ هەتا کەی ناتوانین پاپەند بین بە خوا پەرستی؟ هەتا کەی؟ ئایا چاوەڕێ بکەین هەتا مردن یەخەمان دەگرێ لە بێ ئاگایی، بەخوا مردن ڕەت بوونی نیە، بەڕاستی پەشیمانی لەو کاتە وەکو ئێستا نیە هەتا کەی؟، هەمان پرسیارتان لێ دەکەمەوە ئایا کارو کردەوەی ژیانتان دەدات، تا لەسەرپردی (صراط) بپەڕنەوە؟ ئێستا چیتان دەوێ لە ژیان ؟ بۆچی بەدی هاتوون تێدا(لەم ژیانە) لە وەڵامەکەتان لەگەل خۆتان ڕاست بن، ئەوە ڕاستی بەسەرهاتی تەوبەی من بوو بەرەو خوا، لە خوا دەپاڕێمەوە کە هەر کەسێك بیخوێنێتەوە سوودی لێ وەربگرێ وچیرۆکەکەم ببێتە هۆکاری گەڕانەوەی زۆر کەس و وتەکانم بەو قسانە کۆتایی پێ دێنم، کە لەسەرەتاوە دەستم پێ کرد، تکا دەکەم لەهەر کەسێك کە من دەناسێ، داوای لێ خۆش بوون لە خوا بکا بۆ ئەو کەسەی کە لە ڕەمەزان مردو لەخوا بپارێتەوە بۆ ئەو مرۆڤە تازەی کە لە ڕەمەزان لە دایك بوو خوا دامەزراوو بەردەوامی بکا.

اللّهم أمين

# ﴿ نا پـــاكـــى ﴾

پێ دەچێت بەسەرهاتەکەم کەمێك نامۆ بێت، تەمـەنم (٢٣) سـاڵە، لەساڵی چوارەمی کۆلیجی بازرگانیم، لەوەتەی (٥) ساڵە هاوسەردارم، ژیانی رابووردوی نزیکم ناماژەیە بۆ چیایەك لە سەرپێچی، شـەیدای کچان بووم، هەرچەندە خاوەن خێزانیش بووم، بەڵام هەمیشە لەگەڵ کـچان دەردەچووم، فێری تاوانم دەکردن، بەبێ هەست کـردن بـە گونـاح و تـرس لەخوا، لەبیرم چووبوو یان لەبیرم کرد بوو، چی بـچێنم ئـەو دەدوورمـەوە، زۆر ئەو دەستەواژەیەم دەبیست بەڵام نرخیم نـەدەزانی، رۆژێـك لـە رۆژان چووبوومە زانکۆ کاتێك گەڕامـەوە، بـەڵام هەسـتم بـە گۆڕانکاریـەك لـە رووخساری خێزانم بەدی کرد، گومانم پەیدا کرد ودابەزیم ئینجا پاش نیـو کاتژمێر هاتمەوە، دیتم ژنەکەم بە تەلەفۆن قسە لەگـەل گـەنجێك دەكـات، گفتوگۆیەکی دڵداری لە هەمان تەلەفۆن کە من قـسەی پـێ دەکـەم، ئـەو قسە پیرۆزەی خوای گەورە لەسەرم هاتە دی کە دەفەرمووێ: **(کمـا تـدین تدان)** وەخت بوو بیکوژم، ئەگەر خوا رەحمی بە من وئەو نەکردبا.

زۆر بەکوڵ گریام وپاش ماوەیەك چـوومە مـاڵی بـاوکی بـۆ ئـەوەی تەڵاقی بدەم، دیتم تەواو گۆڕاوە

گوتی: لەمەو دوا بە تەواوی خوا دەپەرستم.

وتی لێم خۆش بەو مۆڵەتی کۆتایم بدێ، پاکی بۆ ئەو خوایەی کە وەرچەرخان بەدەست ئەوە ئێستاش سوپاس بۆ خوا گەڕاوەتەوەو هەتا ڕووشی دەپۆشێ ولە پاکی نیازی هەتا فەرز یان سونەتێکی ناچێ وبگرە شەو نوێژیش دەکات منیش وەکو ئەو بەوەش بووینە خێزانێکی لەو پەڕی دینداری وپەیوەست بەدین وبەڵێنمان دایە خوا کە قەت نەگەڕێینەوە سەر تاوان وسەرپێچیەکانمان، سوپاس بۆ خوا، لەبیر نەکەی لەدەرگای خەڵك بدەی لە دەرگات دەدرێتەوە.

# ﴿ مردوو شۆر ﴾

من کچێکم لە تەمەنی (١٨) ساڵیم، حەز دەکەم بەسەر ھاتێکتان بۆ بگێڕمەوە، کاریگەریەکی گەورەی لەسەر دڵم ھەبووە، لەو کاتەی لەسەر نوێژەکانم زۆر رێك وپێك نەبووم،بەڵام پاش ئەوەی بابەتێکم خوێندەوە، وام لێهات ھەموو نوێژەکان لە کاتی خۆیدا بکەم.

رۆژێك لە رۆژان لە قوتابخانە لەوانەی ئایین پارچە کاغەزێکی بچووکیان دابەش کرد، کە تیدا باسی مردووشۆرێکی دەکرد، کە بەسەر ھاتەکەی دەگێرایەوە.

دەڵێ:- تەرمی کچێك ھەبوو ویستیان بیشۆن، بۆ ئەوەی کفنی بکەن وبینێژن پەیوەندییان بە مردوو شۆرەکە کردو ئەویش بە دەم بانگەوازیان چوو، چونکە کاری خۆی بوو، چووە ماڵە، پرسی مردووەکە لە کوێ یە لە دەرگای ژوورەکە بانگیان کرد وئەویش چووە ژوورێ، دەرگای ژوورەکەیان لەسەر مردوو شۆرەکە توند داخست، ئەویش زەندەقی چوو دەستی بەدەرگا لێدان کرد وھەر ھاواری دەکرد، بەڵام کەس وەڵامی نەداوە، دیتی کەس وەڵامی ناداتەوە تەماشای کرد ئاوو کفن لەتەنیشت مردووەکە، ئامادەیە، بەڵام کە سەری مردووەکەی کردەوە بۆ ئەوەی بیشوا، دیتی تەرمێکی رەشی وەکو خەڵووزی تێدایە، سەری سوڕما لە شێوەکەی ولە ژیانی خۆی ترسا، ئینجا دەستی کرد بە خویندنی معوذات و ئایەتی کورسی، دەستی کرد بە شۆردنی، زۆر زەحمەت بوو، چونکە

پێستەکەی وەکو خۆڵە مێشێکی تۆزاوی لێ هاتبوو، هەرکە جەستەی دەست لێ دەدا لەگەڵ دەستی دەڕووشا، پەلە پەلی لە کارەکەی کرد وهەتا رزگاری بێ وبگەرێتەوە، کە لێبۆوە لە دەرگای داو گوتی: تەواوم کرد ئینجا دەرگاکەیان لەسەر کردەوە وبەخێرایی لە ماڵەکە دەرپەری بەبێ ئەوەی کەس وکاری مردووەکە لەهۆکاری دەرپەڕینەکەی بپرسن، پاش چەند رۆژێك سەردانی زانایەکی گەورەی کرد باسەکەی بۆ گێڕاوە گوتی: برۆ لەکەس وکاری مردووەکە بپرسە لە هۆکارەکەی، ئەویش چوو پێی گوتن: دەمەوێ پرسیارتان لێ بکەم لەسەر هۆکاری داخستنی دەرگاکە لەسەرم بەتەنیا ولەگەڵ مردووەکە؟

ئەوانیش گوتیان: هەرچەند مردوو شۆرێکمان دەهێنا بۆ ئەوەی بیشوا، کە حاڵی مردووەکەی دەدیت دەردەپەڕی، تۆ نزیکەی دەیەمین مردوو شۆربووی، کەهاتی کۆتا کەس بووی، ترساین تۆش ڕابکەی ودەرپەڕی، مردوو شۆرەکە گوتی: باشە بەڵام لەبەر چی حاڵی کچەکەتان وابوو، گوتیان: لەبەر ئەوەی (کچەکە نوێژی نەدەکرد....)

هیوادارم بەسەرهاتەکەم سەرنجتان رابکێشێ وکارتان تێبکات، هەروەکو کاریگەری لەسەرم هەبوو، هەروەها ئاگاداری نوێژەکانتان بن چونکە ئایینتانە، هەر کەسێك نوێژەکانی جێ بەجێ بکات، ئاینەکەی جێ بەجێ دەکات، ئەگەر ئەوە حاڵی مردووێك بێت پێش ئەوەی بیشارنەوە، داخوا دەبێ پاش ناشتن چی بەسەر بێت.

## ﴿ قورئان رزگاری کردم ﴾

بەداخەوە جگەرە کێشێکی چلێس بووم، درۆ نیە ئەگەر بڵێم رۆژانە (٢-٤) پاکەتم دەکێشا، بەڵکو رۆژانە (٢) پاکەت کەمتر نەبوو، لە تەمەنی (١٤)ساڵی فێری جگەرە کیشان بووم، بەو نەریتەناشرینە (٢٤) ساڵ بەردەوام بوو، واتە تا دوو ساڵ لە پێش ئێستا، دەتوانم بڵێم لەو ماوە درێژەدا جارێکیش ئەو دۆستە پیسەم (جگەرە) بەرنەدا، بە درێژایی گرینگترین چارێگە سەدەی ژیانم، هەرکەسێك ئامۆژگاری کردبام بەرەنگاری دەبوومەوە، دەستم بە ورتە ورت دەکرد، کە برادەرم بوو لەساغی ونەخۆشی، هەرگیز وازم لێ نەدەهێنا لە رۆژانی زۆر ساردیش نەمدەتوانی هەناسە بدەم.

بە کورتی وەفا دارترین دۆستی نەگبەتی بوو، (٢) ساڵ پێش ئێستا شەوێك زۆر حەزم چووە خوێندنی قورئان، هەستام دەست نوێژم شوشت وقورئانەکەم لەپێش خۆم لەسەر مێزەکە دانا: لە تەنیشتی پاکەتەکەم دانا بۆ دەست پێ کردن، جگەرەیەکم پێ کرد بە نیازی خوێندن پاش جگەرەکەم، جگەرەیەکی تریشم پێ کرد بۆ ئەوەی لە پاشان زیاتر قورئان بخوێنم.

ئینجا دڵم چووێ یان شەیتان هانی دام، سێیەم جگەرە پێ بکەم، بە

نیازێکی(چاك) گوایە زیاتر قورئـان بخـوێنم، ئەوسـا بـەو نیـازەی سـێیەم وچوارەم پێنجەم وشەشەمم هەروەها دەم کێشا، پاش دوو سەعات دیتم کە کۆمەڵـە جگەرەیـەکی ترسـناکم کێـشاوە و یـەك پیتیـشم لـە قورئـان نەخوێندوە، هیچم پیّ نەکرا تەنیا سەرنجی مێزەکەم دەدا کە قورئانەکـە و پاکەتەکەی لەسەر بوو، بیرم کـردەوە لـە تـەرازوێك، کـە دوو جەمـسەری هەیە(تای تەرازوو) لە لای راستی قورئانێکی پیرۆز ولەجەمسەری چـەپەی پاکەتێك جگەرەی بۆگەن هەیە.

بیرم کردەوە کە ماوەی دوو سەعاتە لە تەمەنم، لای چەپی لا سەنگ دەکەم، لە دڵی خۆمدا گوتم: بە خوا لە تیّ چووەکانم، ئەگەر بایەخ بـەلای راستی تەرازوەکەم لە هەموو ژیانی داهـاتووم نـەدەم، هـەر لـەو کاتـەوە جگەرەم نەکێشا، سوێند بەخوا ئەگەر خوای گەورە ڕەحمـی پـیّ نـەکردبام وئـەو بەهرەیـەی نـەدابامیّ بـۆ بـەراورد کردنەکـەم قـەت ڕۆژێـك بـیرم نەدەکردەوە لە واز هێنانی ئەو تاوانە، کە ژیانی خۆم و خێزانمی لە لایەنی تەندروستی ودەروونی ودارایی داڕوخانـد بـوو، ئێـستاش پـاش دوو سـاڵ لەسەر ئەو ڕووداوە دڵنیانیم ڕۆژ بەرۆژ زیـاتر دەبـیّ، لەسـەر ئـەوەی کـە ئەگەر قورئانی پیرۆز نەبا قەت رزگاریم نەدەبوو، لە بەردەوامی ئەو خـووە پیسە، خوا لە کۆڵی کردمەوە، ئەو خووە ناشرینەی کە ئێستا بـە سـووك سەیری دەکەموو بێزم لێی دەبێتەوە، لە هەر ساتێك کە لەژیان کە لەگەڵی دابووم، زیانی گەیاند بوو بە تەندروستی خۆم وخۆشەویستانم وتوانای کـەم

دەکردمەوە لەسەر خوا پەرستی، خوا لە من و لە ئێوەش خۆش بێت کە هەر خۆی بەخشندەو نەرم ونیانە.

لەو کاتەی کەمن ئەو بەسەرهاتە دەگێرمەوە بۆ کەسانێك، کە ئەوانیش رزگاریان ببێت بەهۆی بە کارهێنانی قورئانی پیرۆز، بۆ شیفا وەرگرتن لێی لە هەموو جۆرە دەردێك، ئیتر سوپاس بۆ خوا ودروود وسەلام لە سەر گیانی پاکی پێغەمبەری ئازیز (ص) وهەموو یارانی وهەموو شوێن کەوتوانی هەتا رۆژی لیّ پرسینەوە.

# ﴿ کچێکی بێ ئاگا ﴾

ڕەنگە بەسەرهاتەکەم سادە بێ، ڕۆژانەش دووبارە بێتەوە، بەڵام وابزانم لەهەموو بەسەرهاتێك پەندو وانە هەیە، بۆیە وابۆتان دەنووسمەوە بەسەرهاتەکەم چییە؟ من کچێکی گەنجم لە تەمەنی سی ساڵی لە خێزانیکی دیندار و پابەند و لە باوەشی دایك و باوکێك کەوا هەمیشە بە ئەرکە ئاینیەکانیان هەڵدەستان لە نوێژو ڕۆژوو بەتەواوی، لەبەر ئەوە سەیر نییە ئەگەر بڵێم هەر لە تەمەنی گچکەییەوە نوێژم کردووەو ڕۆژووم گرتووە! سوپاس بۆ خوا لە تەمەنی (١٠) ساڵییەوە دەستم بە نوێژ کردن کرد بە هاندانی ماڵەوەمان، بەڵام بە تێپەربوونی ڕۆژگار، هێدی هێدی کاڵ بووەو خوا پەرستیم وەکو خوویێك لێ هات نوێژ کردنم بەبێ خشوع وبە پەلە دوور لە سونەتەکان. بەڵام سوپاس بۆ خوا هەر وازم لێ نەهێناو ساڵان تێپەری و هەستم بە دڵ تەنگی ودڵە راوکێەکی دەروونی لە ژیان دەکرد، نەمدەتوانی بۆ شوێنە گشتیەکان بچمە دەرەوە، ئەگەر بشچوومایە هەستم بە دڵ تەنگی دەکرد وخەریك بوو دڵم شەق بات، هۆکارەکەم نەدەزانی چییە؟ هەتا دەهات لەگەڵ تەمەنم پتر دەبوو لە تەمەنی (١٧) ساڵی خوا حەجی بە قسمەت کردم، بەوە هەستم بەدڵخۆشیەکی قوڵ دەکرد،هەرچەندە پێشترچەندان جار چووبوومە عومرە هێنانەوە لە پێش حەجکردنم،

بەڵام پاش حەج هەستم دەکرد، کەم وکوریەکی زۆرم هەیە بەرامبەر

خوای گەورە، حەزم لـە هـیچ کارێـك نـەبوو تـەنیا بـیرم لـە بـالاّ پۆشـی دەکردەوە، بەڵام شەیتان لەمن بە هێزتر بوو، رۆژگارتێدەپەری ئەو هەستەم زیاد و کەمی دەکرد بە گوێرەی رووداوەکان. لـە رەمـەزانان ئـەو حـەزەم دەگەیشتە ئەو پەڕی، یان کەدەچوومە عومرە، هەرچەند سەرزەنشتی خۆم دەکرد بەرامبەر ئەو کەمتەر خەمییەم بەڵام دادی نەدام. هەتا گەیـشتمە (رەمەزانی رابردوو) بەرنامەی بەرێز عەمر خالدم دیت، سەرزەنشتی خـۆم کرد، لەسەر ئەم کەمتەرخەمییە وزۆر کاریگەری هەبوو لەسـەر دڵـم، بـە تایبەتی لەو کاتەی کە مامۆستا عەمر گوتی: رەنگە کچ چـەندان سـاڵی پێ بچێت هەتا بڕیاری خۆ پۆشین دەدات، لەگەڵ ئەم قسەیە خەریك بوو لە گریانا شەق ببەم، بەخوا ڕاستە ماوەی (١٣) ساڵی کێشا هەتا بڕیاری خۆ پۆشینم دا، لەو رۆژەوە بریارم دا خۆم بالاّ پۆش بکەم، ئینجا لەگەڵ براکەم بچمە عومرە لەسەرەتای ئەم ساڵە واتە پێش حەج چوومە عومرە وبڕیاری بالاّپۆشیمدا داوام لە خوای گـەورە کـرد بـەردەوام خـواش یارمـەتی دام وبەسەر شەیتانی سەرخستم، لەو کاتەی بە سـواری فڕۆکـە دەگەڕاینـەوە، براکەم لە خۆشی بالاّپۆشیەکەم خەریك بوو بفڕێ‌سەری ماچ کردمو گـوتی: لە مێژە پێش بینیم دەکرد، بەڵام توخوا هەواڵت دایە دایـەو بابـە؟ گـوتم نەخێر بەتەما بووم خۆم ئەو بڕیارە بدەم. گوتی وابزانم خۆشترین موژدەیـە کە بیـان دەیتـێ، ئـەوجا بەراسـتی زۆر پێـی بەختـەوەر بـوون، بابیـشم قسەیەکی پێ گـوتم: کـە هـەرگیز لـە بـیری ناکـەم، گـوتی: جـوانترین و

بەنرخترین دیاریە کە لەماڵی خوا بۆ منت هێناوە، ئینجا لەو کاتەدا وامزانی دنیا هەمووی سامانی منە، ئەوجا تێگەیشتم کە هۆکاری دڵتەنگی چەند ساڵێم لەهەرزەکاری یەوە هەر ئەوە بوو(بێ ئاگای ودوریم لەخوا). بەڕاستی من ناتوانم بە زمان وەسفی هەست ونەستم بکەم کە بۆ ڕابواردن دەردەچووم، بەڵام پاشان دەستم بە دەرچوون کرد بە خۆداپۆشین وبەخۆش حاڵییەوە، لەوەش زیاتر هەرکەسێك بیدیتبام دەیگوت بە باڵا پۆشیە کەتەوە جوانتری ودەیان گوت نوور لەڕووخسارت دەدرەوشێتەوە! ئەویش بێگومان میهری خوا بوو لەگەڵ ڕەزامەندی خۆی بۆمن، هەمیشە دەپاڕامەوە دیەنم بەباڵاپۆشیم ڕێك وپێکتر بێت، هاندانی خەڵکی زیاتر سووری کردم ئەوجا پاش (١٣) ساڵ ئەو بڕیارە بدەم. خوشکان توخوا تکاتان لێدەکەم، خۆتان گیر نەکەن لە بڕیاری باڵاپۆشی، چونکە ئەوە تەنیا وەسوەسەی شەیتانەو بەس، دەتوانن بەسەری دا زاڵ بن، ئەگەر ئەوەشتان کرد قەت لێی پەشیمان نابنەوە، هەست بە ئاسوودەیەکی دەروونی دەکەن کە پێشتر هەستان پێنەکردوەو لێی بێ بەش بوون. لەکۆتایی دا تاکە داوایەکم هەیە، ئەویش دەتوانی ڕەزامەندی خوا بەدەست بێنی تەنیا بە پارچە قوماشێك کە سەرتی پێ دادەپۆشی لەبەرێ ناتوانی؟ زۆر لە خوا بپاڕێنەوە خوا لە بیرنەکەن و لەسەر باڵاپۆشی داتاندەمەزرێنێ، توخوا با بڕیارەکەی ئێوش (١٣) ساڵ نەکێشێت!!

# « کاسێتی ڤیدیۆ »

کچێك خاوەنی سێ خوشك بوو لە قۆنـاغی زانکـۆ دەیخوێنـد، لـە وانەکانی زۆر زیرەك بوو، ناسراو بە ڕەوشت بەرزی وئاکاری جوان، هەموو دۆستەکانی خۆشیان دەویست، حەزیان دەکرد لێی نزیك ببنـەوە، لـە بـەر سـەرکەوتنە ناوازەکەی، گوتی: ڕۆژێك لە ڕۆژان هـەر لـە دەرگـای زانکـۆ دەرچووم، کەوتمە بەرامبەر گەنجێکی ڕێـك وپێـك، سـەرنجی دامـێ وەکـو ئەوەی بمناسێ، هیچ بایەخم پی نەدا، بە دوامدا دەڕۆیشت وبە چرپە قسەی مندالآنەی دەگوتەوە: (کچە جوان من حەز دەکەم ببمە هاوسەرت...) لـە مێژە چاودێریت دەکەم، ڕەوشت وئاکارت دەناسم، ڕۆیشتنەکەم خێرا کـرد وپێم تێك دەنالآن، کەلە پێشتر قەت تووشی شتی وا نەببووم گەیـشتمەوە ماڵێ بە شەکەتی وپەشۆکاوی، هەر بیرم دەکردەوە، ئـەو شـەوە خـەوم لێ نەکەوت لەبەر ترس وتۆقین ودڵە ڕاوکێ، ڕۆژی پاشتر لە کاتی دەرچوونم لە زانکۆ دیسان دیتم واچاوەڕوانە لە دوورەوە زەردەخەنـە دەکـات، ڕۆژانـەی لەسەر ئەو کارەی بەردەوام بـوو، ڕۆژێـك لەبـەر دەرگـای ماڵمـان پارچـە کاغەزێکی گـچکەی بـۆ فڕێـدام، دوودڵ بـووم لـە هەڵگرتنـەوەی، بـەڵام هەرچۆن بوو هەڵمگرتەوە، دەستەکانم دەلەرزین وکردمـەوە، خوێندمـەوە، پڕی بوو لە قسەی خۆشەویستی و دەستی بە پاساو هینانەوە کرد، لەسـەر ئەوەی کە هەراسانی کردووم. کاغەزەکەم دڕاند وفڕێمدا. پـاش ماوەیـەك زەنگی تەلەفۆن لێیدا، هەڵمگرت دیتم هەمان گەنجەکەیە بەقـسەی خـۆش گوتی نامەکەت خوێندەوە؟

پێم گوت: ئەگەر نەبیتە پیاو بەكەس وكارم دەڵێم قوڕت بەسەر...

پاش ماوەی یەك سەعات پەیوەندی كردەوە گوتی: نیازم پاكەو دەمەوێ هاوسەرگیریت لەگەڵدا بكەم، گوایە دەوڵەمەندەو خانووێكی خۆشم بۆ دروست دەكات، هەموو ئاواتم بەدی دەهێنێ وئەو هەر خۆی تاقانەیەو كەسی دی لەماڵیان نیە...و...و... ...دڵم نەرم بوو دەستم بە قسان كرد لەگەڵی و درێژەم پێدا، هەمیشە چاوەڕوانی زەنگم دەكرد، كە لەزانكۆ دەردەچووم چاوم دەگێڕا بەشكو بەدیار بكەوێ، بەڵام سوودی نەبوو، رۆژێك لە ناكاودەركەوت وئۆتۆمبێلێكی پێ بوو هاتە بەرامبەرم، لە خۆشیان خەریك بوو بفڕم، دەستم كرد بە گەڕان بەناو شار لەگەڵی، هەستم دەكرد كە من گیرۆدەی ئەوم وپەك كەوتووم لە بیركەوتنەوە، وەكو ئەوەی هۆش لە جەستەم دابڕابێت. خۆشباوەڕ بووم هەرچی دەیگوت: باوەڕم پێ دەكرد، بە تایبەتی كە دەیگوت تۆ دەبیتە تاكە هاوسەری ژیانم، وپێكەوەلە سایەی یەكدا دەگیرسێینەوەخۆشیی و ئاسوودەیی لە سەرمان دەشەكێتەوە، باوەڕم دەكرد كە دەیگوت تۆ ئەمیرەكەی منی، هەرچەندە ئەوەم دەبیست بە خەیاڵ دەفڕیم وسنووری نەبوو، رۆژێك لە ڕۆژان ئای كە ڕۆژێكی ڕەش بوو... ژیانی وێران كردم، پاشە ڕۆژی بردم، لە بەرامبەر خەڵكی ئابڕووی بردم، وەكو پێشتر لەگەڵی دەرچووم، دیتم بەرەو شوقەیەكی بردم، دابەزین پێكەوە دانیشتین، فەرمودەی پێغەمبەرم ﷺ لەبیرچوو كە دەفەرمووێ: ﴿لا يخلون رجل بامرأة الا كان ثالثهما الشيطان﴾ رواه الترمذی

واتــە: ((هەر ئافرەت وپیاوێــك پێکــەوە کۆببنــەوە، مەگــەر ســێ یەمیان شەیتانە)).

بەڵام شەیتان دڵمی داگیر کرد و بەقسە لەگــەڵ گەنجەکــە دانیــشتین سەیرم کرد وسەیری کردم، تارمایەکی رەش دیلــی کــردین بــەرەو دۆزەخ، نازانم بەڵام هەرئەوەندە دەزانم کە بوومە نێچیری ئەو کــوڕەو بــە ئــرخترین پیرۆزی خۆم دۆڕاند، وپاشان هەستامەوە وەکو دێوانە گوتم: چیت لێ کردم؟ گوتی: مەترسە تۆ هاوسەری منی، چۆن بوومە خێزانت بێ مــارەیی؟ بــەم زووانە مارەت دەکەم، بە شپرەزەیی گەڕامەوە ماڵ، هێزی رۆیشتنم نەبوو، ئاگرێك لە جەستەم بەر ببوو... خوایە چ تــاوانێکم کــرد؟ چــی لێ کــردم، دنیا لەبەر چاوم تاریك بوو، بەکوڵ دەستم بە گریان کــرد، گریــانێکی تــاڵ وەك زەقنە بووت، ئەوجا وازم لە زانکۆ هێناو کەوتمە خراپترین شــپرزەیی، کەسیش لە کەس وکارم نەیان دەتــوانی لــەحاڵم بگــەن، ئــەو تروســکاییە هیوایەی کە هەمبوو، ئومێدی مــارە کــردنم بــوو، رۆژگــار تــێ دەپــەرین ولەسەرم گرانتر بوون لەچیا، داخوا دوایی چی روو بــدات. ئــەوەی زیــاتر ژیانی وێران کردم ئەو زەنگە بوو کە لەپڕێکەوە لێــی دا، هــەر لــەدوورەوە دەنگی هاتوو گوتی: دەمەوێ بۆ کارێکی گرینگ بتبینم، خەنی بووم ولــە خۆشیان کەوتمە سەما، گوتم: هەبێ ونەبێ باسی مارە بڕینمــە... چــوومە ژوانی دەم وچاوی گرژ ومۆن بوو، بەر لە هەموو شتێك گوتی: ئەوەی بیری لێ نەکەیتەوە مارە کردنە، ئەو شتە روونادات، دەمەوێ پێکەوە بێ مارە کردن ڕابوێرین، بێ ویستی خۆم دەســتم بڵنــد کــرد وشــەقە زللــەێکم لــە

بناگوێی دا خەریك بوو بریسکە ئاگر لە چاوی دەرپەڕێ.

وامزانـی تـۆ هەڵـەی خـۆت راسـت دەکەیـەوە... بـەڵام دیـتم کابرایەکی بەد رەوشت ونالەباری، بەپەلە لە ئوتومبیلەکە هاتـە خـوارەوە دەگریام، گوتی: پیرۆزت بێ، کاسێتێکی ڤیدیۆی دەرهێنا و بڵندی کـرد و بە دەنگێکی بەرز گوتی: ئا بەو کاسێتە وێرانت دەکەم! گوتم: ئەم کاسـێتە چی تێدایە؟ گوتی: خێرا سوار بە بانیشانت بدەم ئینجا دەبینـی چـی یـە. ئینجا سوار بووم و لەگەڵی رۆیشتم بۆ ئەوەی سـەیری کاسـێتەکە بکـەم، دیتم هەرچی نالەباری هەیە کە کردبوومان هەمووی تۆمار کرا بو، گـوتم: ئەوە چیت کردوە هەی ترسنۆك، هیچ وپوچ.

وەڵامی دایەوە: چەند کامیرایەکی شاراوە لەسەر سـەرمان هـەبوو، بە جولە و چرپەوە تۆماری کردوە!! ئـەو کاسـێتە چـەکێکە بـە دەسـتم، ئەگەر لە ژێر فەرمانم نەبی ولە قسەم دەرچی، بەوە ئابرووت دەبەم، دەستم بە گریان وهاتوو هاوار کرد، چونکە کارەساتەکە تەنیا بەمنەوە پەیوەسـت نەبوو، بگرە هەموو خانەوادەکەم پێ گرفتار دەبوون.

گوتی: چارەت نی یە.... ناچار بوومە کۆیلەی دەسـتی بەرەبـەرە وام لێ هات، لە پیاوێك بۆ یەکێکی تری دەبـردم ونرخەکـەی وەردەگـرت، کەوتمە نیگبەتی، ژیانم بەرەو بێ ناموسی گۆڕا، کەس و کاریـشم وێـڕای ئەوەی کە هیچیان لێ نەدەزانی، متمانەی تەواویان پێم هەبوو، تا وای لێ هات کاسێتەکە بلاّو بۆوەو گەیشتە دەستی ئامۆزایەکم، بەڵکو لە هەموو شار بلاّبۆوەو باوکم و هەموو خانەوادەم زانیان، ماڵەکەمان بەبێ ناموس

نـاوی دەرکـرد، ناچـار بـووم خـۆم بـشارمەوەو کـەس نـەمبینێت، بـابم وخوشکەکانم لەم ولآتە ڕایـانکرد، ئـابرو چـوونەکە وای لێکـردین بووینـە بنیشتە خۆشەی کۆڕو کۆبوونەوان، جێگا نـەبوو باسـی ئـەو بابەتـەی لیَ نەکرێ، کاسێتەکە ئەو دەست ئـەو دەسـتی گـەنجانی دەکـرد، وام لێهـات لەتاخمی لەش فرۆشان و هیچ وپوچی نقوم بووم، بەتەواوی بوومە کۆیلـەی دەستی ونەمدەتوانی لێی رزگار بم، هـەر ئـەو کـوڕەش بـووە هـۆی مـاڵ کاولکردنی چەندانی دیکە، لەگەڵ زۆر کچیدی ئەم کارەی کرد بوو، رۆژێك لە رۆژان هاتە لام لەو پەری سەر خۆشی دابوو، منیش ئەم هەلەم قۆستەوە و دامە بەر چەقۆ گوتم بەراستی ئـەوە ئیبلیـسە لـە پێـستی ئـادەمیزاد، خەلکم لە دەستی رزگارکردو کەوتمە بەندیخانە، بەلآم چارە نووسم لەو پەڕی شەرمەزاری و سەر شۆری ونائومێدی بـوو، لـەدەر ئـەنجامی ئـەو کـارە ناشرینە کە ئەنجامم دا، تێدا بە فیرۆ چووم، ئێستاش هەرچەندە کاسـیەتی ڤیدیۆ دێتەوە بیرم وادەزانم کامیرا بە دوامەوەیـە، ئـەو سـەر گوزەشـتەی خۆشم بۆ ئەوە نووسیوە، ببێتە دەرس وپەندو ئامۆژگاری، بۆ ئەو کچانەی خۆش باوەڕن، بە قسەی بریقـە دارو نامـەی ڕازاوەی بـەناو خۆشەویـستی هەلنەخەلەتین وخۆیان لە مۆبایل وتەلەفۆن بپارێزن، خوشکەکانم خۆتان لـە مانە بپارێزن، وامن بوومە پەند و ژیانم کۆتایی پیَ هات بە وێران بـوونی خۆم و خانەوادەکەم و باوکە ڕەنجە ڕۆکەشم کەلەسەر من لە داخـان سـەری نایەوە لەسەرە مەرگی هەر دەیـــــــــگوت :(حسبـي الله ونعم الوكيل)

# ﴿ قەدەری خـــوا ﴾

بەسەرهاتەکەم درێژەو کۆتاییەکەی پڕ ئـێش وتاڵـە لەئـەنجامی ئـەو گرفتارییەی تووشمان بـوو، سـێ خوشـك وبرایـەك بـووین مـنو براکـەمو خوشکێکمان نوێژمان نەدەکرد وهەمیـشە گوێمـان لـەگۆرانی و ئاهـەنگ دەگـرت وتەماشـای فیلمـان دەکـردو دەچـووینە بازارەکـان، زۆربـەی ڕۆژەکانمـان لـەبازاڕ ڕادەبـواردو کەدەهاتینـە مـاڵیش، لـەدیار کەناڵەئاسمانیەکان دادەنیشتین، ئەگەر بەدڵیشمان نەبا ئەوجا ڤیدیۆو ئەگەر شتی تازەش نەبا دەچوینە سەر گۆڤارەکان وماوەی کاتەکانی دیش خواردن وخواردنـەوەو نوسـتن بـوو، وەکـو دووری ڕۆژهـەلات لـەڕۆژئاوا لـەخوا دووربووین نەماندەزانی نوێژ چییەو کاتەکەی چی یە؟

هەموو ئەمانە لەلامان هیچ گرینگی نـەبوو، ڕابـواردن وخۆشـی دڵ لەپێشەوەی کارەکانمان بوو، لەهاوینیش گەشتی دوورمان دەکرد هەتا ئـەو چالاکییەی لەکاتی خوێندنمان نـەمابوو بگەڕێتـەوە، بـاوکم سـەرقاڵ بـوو بەکۆمپانیەکانی پارەکۆکردنەوەو سـەفەری کـار لەگـەڵ دایکـم، ئێمـەش زۆربەی کاتەکان لێیان دووربوین، ئـەوان خـەریکی کـارەی خۆیـان بـوون ئێمەش خەریکی خۆمان بووین بەبێ ئەوەی کەس پێمان بڵێ نوێژ بکە یان بیری خوا یان یادی خوا بکە کێ وابڵێ؟

خزمەت کارەکەمان لەئێمە بەدبەخت تربوو، بەلام ئـەوەی کەهـەمان

بوو خوشکە گەورەکەمان بوو، کەلەگەڵ خوا دەژیا، تەواو پێچەوانەی ئێمە بوو، هەمیشە لەجێگای دایکم بەمن وبراکەمی دەگوت نوێژبکەن...بەڵام ئێمە هیچ گوێمان نەدەدایێ سەرپێچیمان دەکردو دەمانگوت، حەقت بەئێمە نەبێ وتۆ لەگەڵ خوای خۆت بە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو ژیانە دوورو درێژە، خەم وبەدبەختی دایگرتبووین، نەماندەزانی هۆی چییە فەرامۆشمان دەکردو وامان دەزانی هەرچەندە کاتمان بەشەونخونی وناهەنگ رابوێرین، بەختەوەر دەبین، بەڵام بیرۆکەکەمان هەڵەیەکی گەورەبوو، هەمان رۆژ هەمان شتمان دووبارە دەکردەوە کەتوشی بێزاری ببوین، بەڵام هەر دەگەڕاینەوە سەری وزیاتر توشی دڵ رەقی ودووری لەخوا دەبووین، هەرچەندە خوشکەکەمان، باشترین خوشك بوو نوێژی دەکردو رۆژی دەگرت وبەزۆری لەوپارەی دەیبەخشی کەباوکم دەیدا هەموومان و زۆر بیری دەخستینەوە، ئەو جل وبەرگانەی بۆمان دەهێنا، دەیدا بەهەژارو بێنەوایان باکی نەبوو بەڵکو بەئومێدی بەخششی خوابوو، رۆژێك لەرۆژان کەدەچوینە سەردانی پلکمان بەیەکەوە هەرسێ خوشك وبراکەم، برایەکەم کاسێتێکی گورانی لەناو سەیارە کردەوە، ئێمەش دەمان گووتەوە خوشکەکەم هەر بەبراکەمی دەگوت، ئەو شەیتانە بکوژێنەوە کری کەوە، بەڵام براکەم رەتی دەکردەوە وئێمەش رەتمان دەکردەوە داوای کرد کەکەمێك خێراییەکەی کەم بکاتەوە، بەڵام بەگوێی نەکرد، بەڵام لەهیکەوە توشی رووداوێکی ترسناکی ئوتومبێل بووین، سەیارەکەمان چەند جار

وەرگەڕا بەهۆی کەوتنمان بەتاسەیەکی ئاسنی ڕێگا، پاش ماندوبوونێکی زۆر لەناو ئوتومبیل ئێمەیان دەرهێنا وبەخێرایی ئێمەیان گەیاندە نەخۆشخانە، بەڕاستی ڕووداوەکە ترسناك بوو تووشی شکست وڕووشان‌و هەژانی مێشك بووین، پاش ئەوەی بەهۆش خۆمان هاتینەوە، پرسیاری خوشکەکەمان کرد، لەسەرەتا پێیان گوتین باشە، بەڵام وا لەبەشی ئینعاشە، پاش (٢٤) سەعات دایك وباوکم لەسەفەر هاتنەوەو لەخوشکەکەمیان پێچایەوە، هەواڵیان پێدان کەخوشکەکەمان مردووە، پاش ئەوەی کەئەوەمان زانی کەوتینە شین وگریانێکی بەکوڵ لەسەری، ئێمە بووینە هۆی مردنی، پاش ئەوەی زۆر لەنەخۆشخانە ماینەوە، خواردن وخواردنەوەم لەخۆم قەدەغەکرد، لەخەمی خوشکەکەم، تووشی نەخۆشی دەروونی بووم، پاش ئەوەی پزیشکەکان ودایك وباوکم زۆر هەوڵیاندا پاش هەوڵێکی زۆر من وخوشك وبراکەم تۆبەمان کرد، بەتۆبەیەکی یەکجاری گەڕاینەوە لای خوا، خواش ڕێنوێنی کردین بەرەو ڕێگایەکی ڕۆشن، کەلەمێژبوو لێی بێ بەهرەبووین، بەڵام دەرسەکە زۆر سەخت بوو، بەتایبەتی مردنی خوشکمان، تەمەن لە (٢١) ساڵ تێنەدەپەڕی، سوپاس بۆخوا دوای گەڕانەوەمان لەڕەمەزان هەموومان پێکەوە عومرەمان کردو باوکیشم حەجی بۆخوشکەکەمان کرد، ئێستاش هەموومان زۆر بەختەوەرین لە سایەی خوا، دەستمان کردووە بەکاری چاکەوبەخشین وچوونمان بۆکۆڕی زانست وبانگەوازی لەپێناو ئەوانەی

کەلەخوا دوورن، بۆئەوەی خوارێنماییان بکا، هەروەکو ئێمەی ڕێنمایی کردبۆلای خۆی، ئێستاش دایك وباوکمان زۆربەی کات لای ئێمەن، پاش ئەوەی کەزانیان بەڕاستی ماڵ و سامان هەموو شتێك نیە، بەڵکو تەنیا خواپەرستی وپشت بەستن بەخوا تەواوە، لەبەر ئەوەی هەر ئەوخوایە ڕۆزی دەرەو دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێك دا هەیە لەخوای گەورە دەپارێمەوە کەسەرکەوتومان بکات بۆگوێڕایەڵی خۆی وپەیڕەوی فەرمانەکانی وڕێبازی پێغەمبەرەکەی دروودو سەلامی خوای لەسەر بێ.

# ﴿ بەیەکەوە هاوڕێ بووین ﴾

ئەو ڕووخسارە ئەبوو کەپێشتر دی بووم، ئەو ڕووە ئەبوو کەدەدرەوشایەوە بەو ئیمانەپتەوەی بیروباوەڕی ئیسلامی پیرۆز، بەڵێ حالەتی گۆڕا بوو، پێکەنیناوی ببوو، پاش ئەوەی مانای بڕواو واتاکانی لە سەرو سیمای تۆرا بوو، پاش ئەوەی (٣) ساڵ تێپەری، هاتم بۆ ئەوەی بیبینمەوە، کە چاوم پێ کەوت دیتم کەسێکی دی بوو، بەرگیکی جودا لە پێشتری پۆشی بوو، ناوی نازناوێکی دیکەی وەرگرت بوو، پێش چەند ساڵێك دوو هاوڕێی گیانی بووین لێك دانەدەبڕاین، لەسەر بیروباورێکی ڕاستەقینە وپاك گۆش ببوین، بۆخوا خۆشم ویستبوو ئەویش هەروا، زەمەنێك هاوڕاو هاوڕازی یەکتری بووین، هەتا ئەو سات وچرکانە هات، ڕۆژگار بەچەقۆ دڵمانی کون کرد، بەڕاستی دابڕانێکی سەخت بوو، بەجێم هێشت شێوەکەی هەر لە دڵ ومێشکم بوو، لەبیر نەدەکرا هەرچەندە زەمانە بەسەری دا تێدەپەری، ڕۆژو مانگ وساڵەکان لەگەل لاپەڕەکانی زەمانە، لەسەفەرێکی درێژ هەمووی پێچرانەوە، سێ ساڵی تەواو لە ئاوارەییەکی ئەفرین بووم، نازانم چۆن گوزەراندم، بەڵام هەموو ساتەکانی وەك خەونێکی تاڵ بەسەرم دا تێدەپەری، بووە هۆی بەجێ هێشتنی برینێکی قووڵ چارەسەری نەبێ بێجگە لە گەڕانەوە بۆ وڵات، ئینجا ئێستا کاتی ژوانی گەڕانەوەی خاکە خۆشەویستەکەمە، لە فڕۆکە خانەکە هەڵوێستەیەکم کرد بۆ یادوەری

ساتەکانی رابردوویکی نزیك لە یادوەری نیشتیمانەکەم کە زۆر تێدا ژیابووم، ئەو برادەرەشم یاد کردەوە کە چاوەرێی دەکردم، سواری ئەو فڕۆکە زەبەلاحە بووم، کە هۆکاری گەرانەوەم بوو!

بەڵێ بەپەلەو بە پەرۆشەوە سوار بووم، بۆ ئەوەی جارێکی دی چاوم بە نیشتیمان بکەوێتەوە، دەمەویٚ هاورێی وخۆشەویست وکەسانم ببینمەوە، زۆر شت هەبوون، لەدەریایی ئەندێشەما مەلەیان دەکرد، خەیاڵاتم هۆش ودڵی تەنی بوو، کە گەیشتمە ئەو سەعات یەکەی کەمن چاوەرێم دەکرد، بەڵام زۆری پیٚ نەچوو میلی سەعات چواری نیشان دا، یەکسەر دەرپەریم وهەموو ئەو میوانانەم بەجیٚ هێشت، بۆ بەخێرهاتنەوەم هاتبوون، بەهەناسە برکیٚ بەرەو ماڵی(ئەحمەد) چووم، بەپەلەپەل لەدەرگام دا، هاتەدەریٚ بە دڵخۆشی وماچ پێشوازی لێکردم، بەڵام هەستم بە شتێکی نامۆ دەکرد کەلە دڵم دروست بوو، لەدرێژەی قسەکانی بۆم ئاشکرا بوو کەیەك لەم بەدبەختیانەیە زەمانە گۆری بووی، ببووە یەکێك لە بەدبەختەکانی ئەو دنیایە، هەستم بەخەمێکی ئەو تۆ کرد کەدووبارە سەر لە نویٚ برینە قووڵەکانی لە ناخمدا دەتاساندەوە وەکو ئەوەی چارەسەری سەخت بیٚ، هەوڵم دا بەقسە بیگێرمەوە سەر ئەو راستە رێیەی کە پێشتر لەسەری بوو، بەڵام هەر گوێی پیٚ نەدام، سیٚ رۆژ مۆڵەتم دایێ، گوتم بەڵکو بگەرێتەوە سەر ئەو راستە رێیەی من دەمەویست، گەرامەوە ماڵەوە، بەڕاستی هەورێکی رەش سەرمی گرت بوو، راکشام ویستم

هەموو ئەم خەمانە بخەمە ناو زبڵدانی فەرامۆشی، بەڵام بەڵام سەعات لە نیوە شەو لێیدا، خەوم لێ نەدەکەوت ولەدڵێ خۆمدا گوتم: قوڕ بەسەرت دەتەوێ بخەوی، لە کاتێك کەچاکترین هاوڕێت لە دەست داوە؟؟ (گومڕابووە)

هەستم بە چەند فرمێسکێك کرد کە رومەتمیان گەرم کردم ویستم کەمێك ئەو سەرمایەم بۆ لابەرێ، بەڵی نەمتوانی بخەوم گەلێك شت هۆش ودڵیان گرت بووم، بە زۆر شت کە نەمدەزانی چی یە خۆزگەم دەخواست کە هەر سەفەرم نەکردبا، خۆزگەم دەکرد کە هەرنەگەرابامەوە تا ئەو خەڵکە لەسەر ئەو حاڵە نەبینم بە ناوی شارستانیەتی وپێشڤەچوون! پاش سێ رۆژ چوومەوە سەردانی تا بزانم چ گۆرانێك بووە، بەڵام نەمدیت، برایەکی گوتی: لێرە نی یە لەگەل چەند برادەرێکی دەرچووە بۆ سەفەر، لەو ساتەوە زانیم کەوا وەڵامەکەی چیە، بەلا م نەمویست دڵم بێ ئومێد بکەم، ئەو بەشە پاکەی کە لەرووخساری بوو، بەشی منی دەکرد، کەوا هانم بدات بێ ئومێد نەبم، ئومیدێك لە قوڵایی ناخی رووخساری دا، وای لێدەکردم کە کۆڵ نەدەم بەڵام.... چەند جار هەوڵمدا بگەرێمەوە نەمتوانی، دیتم کەوا دڵی داخراوە، بێ ئەوەی کەڕ بێ، وای لێکردم کەوازی لێبێنم وئەو هەموو سالانە لەبیر خۆم بەرمەوە کە پێکەوە تێمان پەڕاند،... ڕۆژگاری هاورێیەتی ودینداری....

گەورە بووین گوناحیش گەورە بوو وێرایی گرفتاریەکە، خوێندنم تەواو

کرد لە زانکۆ دەرچووم بە سەر کەوتوویی، گەیشتمە تەمەنی (٢٦) ساڵی، ژنێکم هەلبژارد کە لە هەمووان پتر دیندار ورەوشت چاکتر بوو، کردمە هاوسەری ژینم، پێکەوە بە گوزەرانێك دەژیاین کە خۆشەویستی وناسوودەیی بوو، رۆژێك لە هاوینێکی گەرم لە گەل خانەوادەکەم دانیشتبووین، زەنگی تەلەفۆنێك هات، کە هەلّم گرت دەنگی ئافرەتێك بوو، بەگریانەوە گوتی: مالّی مەحەمەدە.. بەلێ.. گوتی: من خێزانی برادەرە کۆنەکەتم(ئەحمەد) دەمەوێ یارمەتیم بدەی، ویستم فەرامۆشی کەم یان خۆم بێ باك پێشان بدەم، بەلاّم دیسان پاڕاوەو گوتی: توخوا رزگارم بکە پێویستم بە تۆیە تۆ.... ئەحمەدی کۆنە هاوڕێت توشی خواردنەوەی مادە هۆش بەرەکان بووە یارمەتیم بدە... لەو ساتەوە هەستم بە هێلّنج کرد، ئاخی دەبڕیم هەتا نەمتوانی تەلەفۆنەکە بە دەستم بگرم، فرێمدا هەستام بەرەو مالّی ئەحمەد دەرپەریم، بۆ ئەوەی حالّی بزانم لە چی دایە؟ کە ببووە پێشەنگی بەدبەختیەکانی ئەو دوونیایە، ژنە داماوەکە بە تەواوی پەشۆکاو بوو، قسەکانی دەست پێ کرد گوتی: نەخۆشییەکی کوشندە تووشی کوڕە گچکەکەی بووە، بردویەتە نەخۆشخانە، بەلاّم عانەیەك شك نابات کە بیداتە کرێ وخەرجی دەرمان، داوای لێ کردم بە دوای ئەحمەددا بگەرێم هەتا ئاگام لێیان بێت. بە توڕەیی دەرچووم، خوێن بەری چاومی گرتبوو، دەستم کرد بە دوا گەرانی کۆلاّنێك نەما نەگەرێم، هەتا هیچ جێ نەما سەری پێدا نەگرم، هەتا گەیشتمە (بارێك)مەیخانەیێك

لەو بارانەی کە ئەوانەی وەکو ئەحمەد بێ ئەوا بوون دەچوونە ناوی، دیتم کۆمەڵێك بەدبەخت دەوریان لە شتێك داوە! حەزم کرد بزانم چی یە؟ چوومە پێشەوە سەرم داگرت دیتم ئەحمەدیش لەناویانە لە ناکاو کەوتمە سەر زەوی وکەوتمە ماچ کردنی ودەست بەسەر هێنان، دنیا لەبەر چاوم هەموو تاریك داگەڕا هیچ شتێکم نەدیت بێجگە لە چاوەکانی ئەحمەد کە گلەییان دەکرد، من هۆکار بووم من بووم ئارامم نەگرت لەسەر ئامۆژگاری کردنی، بە هۆش خۆم نەهاتمەوە هەتا دوو رۆژکە خۆم دیتەوە وا لەسەر پێخەفی نەخۆشخانەم لە بێهۆشیەکی ترسناك دا، پاش دەرچوونم چوومە لای ئەو هاوسەرەی کە هیچ ئاگادارییەکی نەبوو، ئەوەی بەدیم کرد تەنیا گلەیی لە چاوەکانی دیار بوو. پرسی بۆچی نەتهێناوە؟ نەمتوانی وەلامی بدەمەوە لەو کاتە ئەو سێ منداڵە کۆسکەوتەگچکانەم دیت لە دەوری بوون! بەلاَم راستیەکە لە ترسەکە گەورە تر بوو. زمانم گرت بەو وشە توندە ئازاردەرانە، هەرچەندە ویستی دان بەخۆی دابگرێ بەلاَم کەوتە سەر زەوی دوا هەناسەی پاکی داو گیانی دەرچوو، چونکە هەر ئەوەندەی بۆ لە ژیاندا بڕیاردرابوو، سێ منداڵە گچکە چاو گەشەکانیش کەوا لەدەوری بەداماوی وەستابوون لەکاتێکدا بێ تاوانی وبێ کەسی لە چاوەکانیان دەبریسکایەوە، وایان لێ کردم هەست بە گیان کێشان بکەم، بەلاَم کاتی نەهاتبوو، ئینجا منیش هەڵم گرتن ولەگەڵ خۆم ئەوانیشم بردەوە بۆ ئەوەی لەسەر ئەویان گۆش بکەم، کە خۆم لەسەری گۆش کرابووم.

# ﴿ لەسەر گۆڕەکەی میز دەکەن ﴾

خاوەن بەسەرهاتەکە دەڵێ: برادەرێکم هەبوو لە جێی برام بوو، هەفتەی رابردوو کۆچی دوایی کردوو و چووە بەر رەحمەتی خوا ئەویش بەرووداوی هاتوچۆ، خوا بەرەحمی خۆی دایپۆشێ سەبرو ئارامیش بە کەس وکاری بدات، ئەو برادەرە چەند رەوشتێکی خراپی هەبوو، هەروەها سایتێکی لە فیلمی سێکسی هەبوو، گرفتاریەکەی ئەوەیە هێما نهێنیەکەی لەناو پێگەکە نازانین.

دەمانەوێ بیسڕینەوە بەڵام ناتوانین... خەڵکینە لەو کاتەی کەلەسەر دارە بازە هەڵگیرا بوو، نالەو دەمەدا پێگەکەی وێنەی سێکسی دەگواستەوە(**حسبنا الله ونعم الوكيل**) دایکی لە خەوندا دیتبووی، کە منداڵان بەسەر گۆڕەکەی دەکەون ومیزی لەسەر دەکەن، دایکە داماوەکەی نازانێ نهێنی ئەو شتە چی یە؟ بەخوا ئەو منداڵانەی میزی لەسەر گۆڕەکەی دەکەن ئەو منداڵانەن کە سەیری سایتە قۆرەکەی دەکەن، پەیوەندیمان بە کۆمپانیاکە کرد لەسەر سایتەکە گوتیان ئێمەش هیچمان پێ ناکرێ ناتوانین رەشی کەینەوە.

خەڵکینە ئەو پیاوە مرد... لە کردەوەکەی دڵمان ژان دەکات، هەتا کەی ئەو کارە هەروا بەردەوام بێ، ئەو کۆمەڵە سایتە چەپەڵ و پیسە کە بۆتە

چەواشە کاری شەیتان وجنۆکەو مرۆڤ، خوا بمان پارێزێ لەو کەسانەی ئـەو پێگەیەیان دامەزرانـد بـۆ گـومڕا کـردن، توخـوا ئێـوەش ئـەم پەیامــەم بڵاوبکەنەوە بۆ ئەو کەسانەی هێشتان زیندون وهەناسەیان لەبەر دایە، بـۆ ئەوەی پەندو وانەی لێ وەرگرن، بۆهەرکەسێك کەوا سایتی رووتــی هەیـە، یان بەشداری هەیە، پێی دەڵێم سوێند بـەخوا دەخـۆم ئـەو تاوانانـە هـیچ سوودێك ناگەێنن، بەڵکو تەنیا دامـاوی وداخ وپـەژارەو پەشـیمانیت پـتر دەکەن وقوڕی خەسترت بۆ دەگرنەوە، بۆ ئەو ڕۆژەی کەوا گریانی پەشیمانی داد نادات، **(حسبی الله ونعم الوکیل)** خـوا بەسـەو چـاکترین پـشتیوانە خەڵکینە لەخوابترسێن واز لەو کەناڵە ڕووتو خراپانە بهێنن، دەنا بەخوا! لە هەردوو جیهان خراپ دەدۆڕێنن.

# ئاخیر شەڕ ﴿ کۆتاییەکی بەد ﴾

لەو کاتەی هەموو ڕۆژێ بەسەر نەخۆشەکان دا دەگەڕام، لە ژووری چاودێری ورد لەنەخۆشخانەی کەنەدی کاتێك لە لێکۆڵینەوەی پزیشکی دا کارم دەکرد، زۆر ناوی نەخۆشێك سەرنجی ڕاکێشام، ناوەکە مەحەمەد بوو، لەسەر پێخەفی ژمارە سێ (٣) خەوتبوو، سەرنجم دا خەم وپەژارەیم لەروخساری دەخوێندەوە، بەدبەختیم لە سیمای بە دی دەکرد، لەو کاتەی کە خەریك بوو دەم وچاوی لە ناو وایەرەکانی ئامێری فریاگوزاری بزر ببوون، گەنجێکی تەمەن (٢٥) ساڵان بوو، تووشی نەخۆشی نەمانی بەرگری (ئایدز) ببوو، دوو ڕۆژ پێشتر هاتبووە نەخۆشخانە بەهۆی هەو کردنی سینگی، لەبارێکی یەکجار ترسناك دابوو، نیمچە بێ ئومێدی لێ بەدی دەکرا، ئەوەش یەکەم نەخۆشی موسلمان نەبوو، کەلە وڵاتانی عەرەبی بێتە وڵاتی کەنەدا بۆ چارەسەری، بەڵام زیاتر هەستێکی سەیر رایکێشام کە هۆکەم نەدەزانی، پاش ئەوەی کەدەوامی بەیانیم تەواو بوو، ماوەیکم وەرگرت بۆ ئەوەی لەم کوڕە نزیك ببمەوە، ویستم بە هێمنی بیدوێنم، هەرچەند گوێی لێم بوو، بەڵام نەیدەتوانی وەڵامم بداتەوە، تەنیا بە چەند وشەێکی پچڕ پچڕ کە تێی نەدەگەیشتم، ئەوجا پەیوەندیم بە ماڵەوەیان کرد، دیار بوو لەبنچینەدا عەرەبی لوبنانی بوون، باوکی بازرگانێکی گەورە بوو لەو شارە خاوەنی کۆگای شیرنەمەنی

بوو،لەپەیوەندیەکەم باسی نالەباری کوڕەکەم بۆیان دەکرد، لەو کاتە دا زەنگی خەتەرناکی بەرز بویەوە بەشێوەیەکی ترسناك، ئەویش ئاماژەی دابەزینی سوڕانەوەی سوڕی خوێنی لە جەستە دەکرد، بەدایکیم گوت: پێویستە هەر ئیستا بێی ولێرە ئامادە بی، هەرچەندە کات درەنگ بێت، تەلەفۆنەکەی داناو پاش نیو سەعات سستەرەکە پێی گوتم: دایکی هاتوەو ئامادەیە، دیتم ژنێکی لە ناوەراستی تەمەن دابوو، هیچ رواڵەتێکی ئیسلامەتی پێوە دیار نەبوو، دیاربوو پەشۆکاو بوو، باسی نالەباری حالەتی کوڕکەم بۆی کرد، دەستی بە شین وگریان کرد، ویستم کەمێك هێمنی کەمەوە گوتم: لە خوا بپاڕێوە خوا شیفای بدات، بەسەرا سیمە سەیری کردم گوتی چیت گوت:

گوتم: لەخوا داوای شیفای بۆ بکە.

گوتی: تۆ موسڵمانی؟

گوتم: بەڵی سوپاس بۆ خوا.

گوتی: ئێمەش موسوڵمانین.

گوتم: ماشاء الله بۆ ناچی لای دانیشی وهەندێك قورئانی بۆ بخوێنی، بۆ ئەوەی هەندێك ئازاری کەم بێتەوە، زۆر بە شپرزەیی کەوتەوە گریانێکی بە کوڵ.

گوتی: نازانم.

گوتم: ئەدی چۆن نوێژ دەکەی؟

گوتی: ئێمە نوێژ ناکەین.

گوتم: ئایا بیستوتە(نوێژ بکە پێش ئەوەی نوێژت لەسەر بکرێ)

گوتی: ئێمە لەوەتەی هاتوینە ئەو ولاَتە نوێژ ناکەین تەنیا لە جەژنەکان نەبێ، بەلاَم هەر لەناو دوو ساڵ جارێك دەچــمەوە، ســەردانی گــۆری بــاب وباپیرانم بۆیان دەپاڕێمەوە، ئەوەش بەبێ ئاگاداری مێردەکەم مــن ژنێکــی ویندارم، (سەیرە بەبێ نوێژیش دیندارەو قورئانیش نازانێ)،

پرسیاری کورەکەم لێ کردو گوتی: کورکەم دلّساف بوو، بەلاَم کەمێك لای دابوو لەگەل ئەو کچەی لە سالّی پارەوە لەگەلّی بوو، حالّی یــەکجار بــاش بوو، گوتم: نوێژی دەکرد؟

گوتی: نا، بەلاَم بەنیاز بوو لەکۆتایی تەمەنی حەج بکات، ســەیرە کــێ مسۆگەری سی وچل وپەنجا وشەست سالّت بۆ دەکات، نەك هــەر ئەوەنــدە کێ دەلّی هەتا سبەی دەمێنیی؟ چەندان ساوا سەریان نایەوە بە ناکــامی، بۆ دایەو بابە بوونە مایەی بێ ئارامی.

ئینجا لەکوڕە بەدبەختەکە نزیــك بورمــەوە ئــاوزەنگی مــەرگی دەدا و زەنگی ئامێرەکەش بــەرز دەبــۆوە، دایکەکــەش بــەدەنگی بــەرز دەگریــا وسستەرەکانیش لەدەوری بەواقی ورماوی سەیریان دەکرد، بێ ئەوەی هیچ کەس دەسەلاَتی هیچی هەبێ، ئۆف لە ئازارەکــانی دوا هەناســە! منــیش

ویستم شەهادە بە کوڕەکە بێنم، بەڵام سوودی نەبوو چەندان جار هەوڵم دا وەڵامی نەبوو، پاش کەمێك بە هۆش خۆی هاتەوە... بڵێ **لا اله الا الله**، گەنجەکە بە هەموو ئەندامەکانی هەوڵی دەدا، فرمێسکی لە چاوی قەتیس مابوو، دیتم ڕەنگی ڕەش هەڵگەڕا، هەردەمویست کەمێك لە ئازاری کەم کەمەوە، بڵێ: **لا اله الا الله**. سوودی نەبوو، لێوەکانی دەلەرزین، دەی خوا بکا بیڵێ بەشپرزەیی گوتی: کچە هاوڕێکەم دەوێت..بە هەناسە سواری گوتی دەمەوێ دۆستەکەم ببینم... لێدانی دڵی کەمتر دەبووەوە هەناسەکانی کەم بۆوە خۆم پێ نەگیرا، بە کوڵ دامە پرمەی گریان توخوا بڵێ... ناتوانم... دەستی لەناو دەستم بوو هەناسەی راوەستاو تەواو بوو! دایکەکەش بە هات وهاواری گریان وەرگەڕا سینگی خۆی وکوڕەکەش ڕەش هەڵگەڕا، منیش هەموو ڕێسایەکی پزیشکیم لەبیر چووبوەوە، بەدەست خۆم نەبوو کەوتمە شین وگریان و بەسەر دایکی دا هاوارم کرد: تۆ خۆت بەرپرسی، تۆ وباوکی ئەم کوڕەتان دۆڕاند، ئەمانەت وراسپاردەی ئێوە بوو، چیتان بەسەر هێنا، دایکەکەش هەر دەگریا: ﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجۡتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجۡعَلَهُمۡ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءٗ مَّحۡيَاهُمۡ وَمَمَاتُهُمۡۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ٢١﴾ (الجاثية)

ئیبن قەیمی جەوزی ﷺ دەفەرموویێ: ئەگەر بەندە لە کاتی بێداری تەواو هێز وتوانا و هەستیاری دا شەیتان پێی بوێری ودەستە مۆی بکا بۆ ئەوەی

سەر پێچی خوا بکات، ئاخۆ دەبێت لە کاتی نەمانی هێز وشپرزەیی دڵ ودەروونی وگیان کێشان؟ لەو کاتە دا کەهەموو شەیتانەکان لەسەری کۆ بونەتەوە بەهەموو هێزو توانایان دەیانەوێ بەسەری دازاڵبن وبیقۆزنەوە، ئایا لەو کاتە دا ئەوبەندەیە بەهێزترە، کەشەیتان دەوریان داوە، یان بێ دەسەلاّت ترە لەو حاڵەتە، جا کێ دەربازت دەکات لە تاوانەکانت لەم کاتە دا ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾﴾ (إبراهيم)

واتـە: ((خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیـان هێنـاوە پایـەدار دەکـات لەسـەر گوفتـاری بـەجێ و دروسـتیان لـە ژیـانی دنیـادا، لـە سـەرە مـەرگ و لەقیامەتیشدا، (باوەری دامەزراو فریایان دەکەوێت و) گوفتاریـان ڕێـك و پێك و دامەزراو دەبێت و بەئیمانەوە دەمرن، لەولاشەوە هەر ئـەو خوایـە ستەمکاران گومرا دەکات و ئەوەی پەروەردگار بیەوێت هـەر ئـەوە پـێش دێت و دەکرێت.)) (ت:ئاسان)

بێگومان خوای گـەورە بـەهانای بەنـدە دڵـسۆزەکانی دێـت و بەتایبـەتی لەسەرەمەرگیش دامەزراویان دەکات لەسەر یەکتاپەرستی وشەهادەهێنان.

*(خوایە ئێمەش لەوان بگێرە..)*

*ئامـــــــــین*

# ﴿ کچێکی ئەمەریکی ﴾

سەلام و ڕەحمەتی خواتان لەسەربێت.

درووود دەنێرم بۆ گیانی پێغەمبەری ئوممەتە ﷺ، ناوم ڤالنتینایە بەڕەسەن ئەمەریکی ولەوێ لەدایك بوومە، گەورە بووم لەو ولاتەی هەموو ئاینەکان لەخۆ دەگرێت،موسڵمان نەبووم ورۆژێکێش نەبوو خەمی لێ بخۆم، لەبەر ئەوەی دایکم وباوکم زۆر بەتوندی دژی ئەم ئایینە بوون و پێیان خۆش نەبوو هیچ نیازێکیان نەبوو ئایینەکەیان بگۆڕن، کەلەسەری پەیدا ببوون، باوکم لەزۆر لە ولاتان خاوەنی چەندان کۆمپانیای گەورە بوو،، دایکیشم لە کارەکەی یارمەتی دەدا، راوێژکارێکی ئابووری بەباوکمی گوت: چەند لقێك لە ڕۆژهەلاتی ناوەراست بکاتەوە لەبەر ئەوەی ناوچەکە بۆ دوا ڕۆژ لەبارە، پاش چەندان هەوڵ وراوێژکاری، باوکم رازی بوو لەسەر ئەوەی بێتە یەکێك لە ولاتەکانی عەرەبی بۆ سەیر کردنی بارودۆخەکە بەچاوی خۆی، کە هات زۆر سەرسام بوو پێی، منیش لەگەلیدا بووم، نزیکەی یەك مانگ ونیو لەو ولاتە ماینەوە لەو ماوەدا هەندێك عەرەبمان ناسی، بوونەجێی ڕەزامەندی من لەسەر ڕاستگۆیی ورەفتاری چاکی ورەوشت جوانی بەهەمان زمانی من قسەیان دەکرد، بەلام من لەبەر ڕێزگرتنیان بە باوکم گوت: زمانی عەرەبیم فێر بکات هەتا نزیك تر بم لەوەی کەوا ئەوان دەیلێن، بەکردەوەش دەستم کرد بە فێربوونی زمانی

عەرەبی، ئینجا دیتم کە زۆر لە زمانەکەی من جوانترە، پەیوەندی ڕێك وپێکم لەگەلیان بەستا، ئێستاش کاتی گەرانەوەم لەو ولاتەی کە بەخشش ومیوان داری خۆشمان تێدا رابوارد هاتووە، یەکێك لە دەستە خوشکەکانم دیاریەکی دامیّ و داوای لیّ کردم، نەیکەمەوە هەتا نەم ولاتە بەجیّ دێلم، واتە هەتا لەویّ دەڕۆم، منیش بە گوێم کرد وگەیشتمەوە ولاتەکەی خۆم ودیاریەکانم نەکردەوە، خەلکی دیکەش بە دیاری دابویانە من، بۆ ئەوەی یادیان بکەم، پاش دوو ڕۆژ چوومە لای خەلکێکی عەرەب بۆ پرۆڤە کردنی ئەم زمانە نوێیەو شارەزا بوون لە پێکهاتەکانی، بەو شێوەیە بەخێرایی فێری ئەو زمانە نویّ یە بووم، هەروەها چوومە پەیمانگایەك بۆ فێربوون و خوێندنەوە و نووسینی عەرەبی، هەرچەندە شتێك فێر دەبووم، زێتر داوام دەکرد، لەو کاتەدا ئەو دیارییەم بەبیر هاتەوە کچەکە پێشکەشی کردبووم، کە چوومە مالەوە کردمەوە، دیتم کتێبێکی ژیان نامەی پێغەمبەر ﷺ تێدا بوو، دەستم بە خوێندنەوەی کرد، کەخوێندمەوە دەستم بە گریان کرد، لەسەر هەلسوکەوتە جوانەکانی پێغەمبەر ﷺ شارەزابووم، لەگەل خەلکەکە موسلمان با یان نا، هەروەها زۆر سەرسام بووم بە خۆشەویستیەکەی بۆخێزانەکەی خەدیجە کەچەند خۆشی دەویست، هیچ ژنی بەسەر نەهێنا هەتا مرد، سەرم سورما لەو خێزانە کەزۆر یارمەتی دا، لە پشتیوانی راوەستا هەتا مرد، ئەو سۆز وناسکیەم بروا نەدەکرد، هەتا بەیانی بۆوە بەخێرایی چوومە سەنتەرێکی

ئیسلامی داوای زیاترم لە ژیان نامەی کرد، دیتم کە رەفتـار وپێـشوازیان لەگەڵم زۆر جوان بوو، پاش چەند رۆژێکی کەم چوومەوە سـەنتەرەکەلێیانم پرسی: چی بکەم هەتا ببمە موسڵمان؟ گوتیان:پێشەکی پێویستە شـەهادە بێنی و خۆت بشۆی و فێری دەست نوێژو نوێژت دەکەین.
یەك چرکە لەو کارە خۆم نەگرت، موسڵمانی خـۆم راگەیانـدو هـەمان رۆژ لەبەر خۆشەویستی ئەو پێغەمبەرەﷺ بەرێزە دەستم پیٚ کـردو لەوپـەری بەختەوەری دابووم کە پێشتر تامم نەکرد بوو، هەواڵم نەدا دایـك و بـاوکم بەوەی بەجێم گەیاندبوو کە مافی خۆم بوو بـەلاّم لـەو لایەنـەی کـە مـن دەمـــەویٚ بـــە ژیـــانێکی جـــوان بـــژیم هـــەروەکو خـــۆم دەژیـــم و پـــاش بیرکردنەوەیەکی قووڵ هەواڵم دانیٚ، زۆر بە توندی ڕوو بـە ڕووم بوونـەوەو هەوڵیاندا ڕازیبم بگەڕێمەوە سەر ئایینی (مەسیحی) پێـشتر پـێم گـوتن: وەرن ئاینێکم فێرکەن کـە ئـەو هـەموو مانایانـە لـە ئاسـکی بەخۆیـەوە هەڵگریٚ و تێـدا بـیٚ؟ زۆر گفتـو گـۆم لەگـەڵ کـردن، بـەلاّم نـەیانتوانی بمگێرنەوە، چونکە من بەڵگەم پیٚ بوو لە کۆتاییش بردمەوەو بەسەریاندا سەرکەوتم ئینجا گوتیان: ئەوە ئازادی کەسیەتی خۆتە، ئینجـا بـەخێرایی چوومە بازار بۆ تەواو کردنی رێبازەکەم کە دەستم پـیٚ کـرد بـوو ئـەویش بالاپۆشی بوو، کە بەراستی خۆم پۆشـی، چـەند دڵ خـۆش بـووم، چـونکە هەستم کرد مرۆڤێکی پاکو خاوێن و داوێـن پـاکم، ئـەوەش لەمێـژ بـوو پێویستم پێی بوو، ئێستاش سوپاس بۆ خوا پێی گەیـشتم، پـێش ئـەوەی

کات بەسەر بچێ، بەڵام مخابن بەخەم و پەژارەوە کە دەبینم هەندێك موسڵمان لە ئایینەکەیان دوورن و شەرم لە ئایینەکەیان دەکەن بۆچی؟؟ بۆ زانیاریتان گاورو جولەکەکان شەرمیان بە ئاینەکەی خۆیان نییە، هەرچەندە لەسەر هەڵەشن، باشە بۆچی تۆ شەرمت بەخۆیە لەگەڵ ئەوەش ئاینیەکەت لەسەر حەقە و زۆر کەسیش پەیڕەوی جل و بەرگی شەرعی ناکەن، شەرم دەکەن، بۆچی؟ بەراستی ئەوە بەرزی و شکۆمەندیە هەموو کەس بەشانازی و ڕێز تەماشات دەکات، خۆزگە بە جلەکەت دەباو خۆزگە دەخوازن کە لەجێی تۆبان، من تکات لێدەکەم لەبەریکەی چونکە زۆر جوان ترە، لەوەی کە چاو لە ڕۆژئاوا بکەی، کە دەیەوێ وێرانت بکا و لەناوت ببا بەبیرۆکە ژەهراوییەکانی، بەراستی ئەوە ئامانجیانە، نەخێر تۆ لەسەر ئەو شتە چاکەی نەك لەسەر ئەو هەموو گرفتاریەی بۆ ئەوەی لە دینە مەزنەکەت دوورت بکەنەوە، جا ڕێیان مەدەنێ بگەڕێنەوە سەر دینەکەتان، بەخوا ئێوە بەهێز ترن هەزار حیسابتان بۆ دەکرێ، ئەگەر لەگەڵ خوا بن ئەوەش دەیان ترسێنێ، پێیان هەڵمەخەڵەتێ بەراستی شارستانیەتی ئەوان بۆگەن و ئابڕووبەرە هەرچی تێیدایە نارەواو چەپەڵە ئەوان کۆمەڵگایەکن کە دەناڵێنن بەدەست لادان و ئاکاری نەشازو نەخۆشیە دەروونیەکان ئەوان هەموو شستێکیان کرد، بەڵام لەهەموو شتێك گرنگتر ئەو ڕووحە ئاسوودە بەختەوەرەیە، لەبەر ئەوە زۆر تاوان و خۆ لەناو بردن لەوان دەبینی ئەم پەیامەم ئاراستەی هەموو موسڵمانێکی

ئافرەت وپیاو دەکەم کە لەدینەکەی ساردە، داوا دەکەم کە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، پەیڕەوی لە هەموو فەرمانەکانی و نەهیەکانی بکەن, هەتا ڕەزامەندی و بەختەوەری لە خوای گەورەوە وەربگرن، داواکارم لە خوای گەورە کە لەسەر ئەو ئایینە بەرێزو بەپێزە دامەزراوتان بکا، کەوا هیچ کەمو کوڕی لەنگی ونەنگی تێدا نییە، چونکە تەواوەو پڕ لەرەحمەت و داد وەرییە کە زۆربەی ئاینەکانی دیکە تێیان دانیە، ئەوجا بەراستی ئەی خوشك و برای موسڵمان داوا دەکەم کە بگەڕێنەوە سەری ئینجا هەست بەبەختەوەری و سەرکەوتن دەکەن.

بۆ زانیاریتان من ئێستا ناوێکی جوانم لە خۆم ناوە، ئەویش (خەدیجە)یە، بەناوی خێزانی پێغەمبەر ﷺ داواکارم لەخوای گەورە کە لێم قبووڵ بکاو شایەنی ئەو ناوەبم و پەیرەوی بکەم و داواکارم لە من وموسڵمانان رازی بێ هەر خۆی نزیك و وەڵام دەرەوەیە.

ئیدی سەلامی خوا لە هەموو لایەك و خوا پاداشتان بداتەوە لەسەر ئەو سایتەی کە کەمێك پێش ئێستا خوشکێکی موسڵمان لەو ولاتەی خۆی پێ ناساندم، داوا لە خوا دەکەم کە سەرکەوتوومان بکاو لەگەڵ ئەوانیش بۆ کاری چاکەو تیکۆشان لە پێناوی، تکایە هەرچەندە درێژەم دایێ، بەڵام لەبەر خۆشەویستیم بوو بۆتان لە بەر خاتری خوا.

# « گـــۆڕان »

ڕەنگە ناوونیشانەکە واتان تێ بگەێنی، من بە بـێ ئامـانج و نـاوەڕۆك دەژیـام، دوور لــە هــەرواتاو دوور لەهــەر دروشمێــك لــە دررووشمــەکانی ئیسلامەتی، دەمەویست خۆم بەوە قایل بکـەم کـەوا ژیـانم سـوودمەندە، بەڵام دەرچووم، درۆم کردبوو، پیشە وای لێکردبووم کە درۆ بکـەم وخۆشـم بەراست بزانم، ئای لەو ساویلکەیی و سەرە ڕۆی یەم، لە کاتێکدا من بـێ هێز بووم، خۆم بە بەهێز دەزانـی، لـووت بـەرزی ئاکـارم بـوو، لـەجیاتی ڕێکوپێکی هەڵەکارم بوو، لە جیاتی ڕووناکبیریم نەفام بووم، بەڵی من ئەو کەسە بووم، بەڵام سەرەڕای ئەمانەڕاستییەك هەیـە، کـەوا هـیچ سـات و چرکەیەك لەژیانم تێ نەدەپەری ئیلا تێیدا دەگریـام، دەمزانـی کـەوا مـن تاوانبارم، بەڵام دەسـتم بـە تۆبـەوە نـەدەگرت... برادەرانێـك هـەبوون.. دەترسام لە دەستم بچن، باکم بە خوا نەبوو، دەترسام برادەرەکانم لەدەسـتم دەرچن، نەك مافی خوا بدەم، ئای لەو هەڵبژاردنە نارەوایـە، لـە کاتێکـدا واز لە خوای گەورە بێنم، چەند تاوانباربووم!، چەند سەرپێچی کار، چـەند بێ دەسەڵات بووم، چەند نەفام بووم!

تێبینی:- من لە خێزانێکی دیندار بە هەموو مانایەکی گۆش کرا بووم، بە رادەیەك خوشکەکانم بالاپۆش بوون، شەوگخونیەکانیان هەتا کۆتایی شەو هەر خوا پەرستیان دەکرد، بەڵام من لاساری خۆم، دەیان ویست کەوا مـن بە هێز بکەن، بەڵام لەبەر لاساری خۆم و یاخیبوونی ئەوان لە ڕەفتاریان دا

نەیان دەتوانی بمگێڕنەوە و ڕاستم بکەنەوە... بەڵام بەسەرهاتی گەڕانەوەم بۆ لای خوا چۆن بوو: ئەمەش چیرۆکە سەیرەکەمە: سەرەتا دووبارەی دەکەمەوە، خێزانەکەمان دیندار بوون، خوشکێکی پزیشکم هەبوو هاوسەری ئەندازیارێکی هەروەکو خۆی دیندار بوو، هەروەها خاوو خێزانی ئەوانیش وابوون، برایەکی هەبوو کە برا گەورە بووپیشەی دکتۆر بوو، دڵساف بوو تەمەنی (٣٦) ساڵان بوو، لە فریشتە دەچوو، خاوەن ڕووخسارێکی سپی، هەمیشە لێو بەخەندە، نێوچەوانێکی پانی پەری ئاسای هەبوو هەمیشە خەندەیێکی ناسك لە ڕووخساری دەدرەوشایەوە، هەنگاوەکانی دامەزراو بوون، کردەکانی هەر چاکە بوون، (١٢) ساڵ بوو هەتا لە نوێژی بەیانیش بەکۆمەڵ لەمزگەوت دا لە نوێژێکیش دانەدەبڕا.

هەرچی هەبوو لە بێوەژن، بێ باوك، بێ نەوا، هەژار، کوست کەوتە، دەربەدەر، گەورەو گچکە هەموو دەیان ناسی بەچاکە.

هەتا ئەو ڕۆژەی کە بەزینده خەوی دانیشتبووم لەعەسری ڕۆژێکی ٢٠٠١، بیستم دوکتۆر فلانی کوڕی فلان، بەرەو بارەگای خوا کۆچی دوایی کرد.... هتد

بەخۆم گوت: درۆیە، دیسان هۆرێنەیە.... کابووسە، لەدەرگا درا ودڵم ترسا، برام هاتە ژوورەوە بەغەمباریەوە، ئەوجا زانیم ڕاستەو خەو نیە ڕاپەڕیم وپرسیم.

گوتی: لە سەردانی بۆ قاهیرە، دەترسا سەیارەکەی خۆی ببات چونکە ئەو تازە شوفێر بوو، دەترسا نەکو تووشی کارساتێك بێت، بەکرێ چووبوو

سەیارەکەی نەبردبوو، بەسواری پاسێك دەچێ وپێکدادانێك لەگەڵ ئەو ئۆتۆمبیلە گەورانەی گواستنەوە ڕوو دەدات، بەخۆی وچوار کەسی دی، بوونە قوربانی وگیانیان سپارد، جەنازەکەی زۆر بەشکۆوە لەسەر داب ونەریتی ئیسلامەتی گواستراوە بەرەو گۆرستان، هەرکەسێك بەوێ دا تێدەپەری دەیپرسی ئەوە کێ یە مردووە؟ ئەو مردووە کێ یە؟ هەر کەس دەیناسی بۆی دەگریا ودەنگی شین وگریان ئەو ناوەی داگرت بوو، هەموو تاسا بوون، منیش بە غەمباریەوە بەرامبەر گڵکۆکەی راوەستا بووم، دەمگوت: خوایە ئەری ئەوە راستە؟ کەوتبوومە گریان، لەوەش خۆشتر ئەوەیە کە دەم بە قورئانەوە گیانی سپارد بوو، هەرکاتێك سواری پاس ببالەناو پاسەکە کاسێتێکی دەدایە شوفیرەکەو داوای لێدەکرد لەجیاتی گۆرانی پوچ وکاسیەتی نارێك قورئان لێ بدات (ئەوە پیشەی بوو.)

لەوانەی کە رزگاریان ببوو، ئافرەتێك گێرایەوەو گوتی لە ناو قوربانیەکان گەنجێك لە کارەساتەکە سەرنجی راکیشام کە هەردوو لا بسکی سپی ببوو، گرانی و سەنگینیەکەی پێوە دیار بوو، چاوی خۆی هەمیشە دەپاراست وخەندەی لەسەر لیو بوو، سواری پاسەکە بووین شوفیری پاسەکە ویستی کاسێتی گۆرانی بخاتە سەر، بەلاّم ئەو گەنجە گران وسەنگینە گوتی، ئەگەر لێی دەدەی باشتر وایە کاسێتی قورئان بێ، شوفیرەکەش گوتی نیمە، گوتی کەواتە من خۆم بۆتان دەخوینم، قورئانی دەست پێ کرد، بەراستی دەنگی پڕ جۆش وخرۆش بوو، دەنگی خۆش بوو، دەستی پێکردو لە قورئانەکە بەردەوام بوو، هەر دەیخوێند هەتا کاتی

(پێکدادانەکە) پاشان زانیم کە ئەویش مردووە.... ئینجا دەستم بە شین وگریان کرد، بۆی پارامەوە لەخواو بڕیارم دا کە هەر دەبێ بچم بۆ پرسەکەی، ئەو هەواڵەیان بدەمی سەرەڕای ئازاری برینەکانیشم هەر هاتم.

ئەوجا کاتی منیش هات کە بیر بکەمەوە وئێستا ئەی من چ بخوێنم ئەگەر نۆرەی مردنی منیش هەر ئیستا گەیشتە سەرم؟

ئەو پیاوە کچە (١٢) ساڵانەکەی لێی دەپرسێ بابەگیان حەزت لە چییە؟ ئەویش وەڵامی دەداتەوە حەزی لە مردنێکە لە گچکەیی وتەمەن گچکەی بێت، ئینجا کچەکە دەیپرسی بۆچی؟

دەیگوت: هەتا گوناحەکانیشم گچکە ترو کەمتر بن.....

بەراستی بۆ خوا ژیاو هەموو ژیانی بانگ کردن بوو بۆ لای خوا، بە ئامۆژگاری جوان جوان بەراستی لەو کاتەی لە رێگا بوو دەچوو بۆ ئامۆژگای (ناصر)ی دلآن بۆ ئەوەی سەردانی نەخۆشەکان بکات ویەخۆرایی چارەسەریان بکات، لەو رێگایە سەری نایەوەو لەرێگای خوادا مرد، منیش بەو خوا هیدایەتی دام.

هەر نوێژێك بیکەم هەر بە کۆمەڵەو داوا لە خوا دەکەم دەپاڕێمەوە بۆ منداڵەکانی وداواکارم هەموو کردەوەکانی من، ئەویش بەشی هەبێ، چونکە ئەو بووە هۆی نوێژکردنم لە مزگەوت وقورئان خەتم بکەم، سونەتەکان جێ بەجێ دەکەم، شەو نوێژ دەکەم، سەردانی خزمان دەکەم، لە کۆڕی لە خوا ترسان بەشداری دەکەم، لە خوا دەپاڕێمەوە، داوای شەهادەت لە خوا دەکەم.

سەرنج لە بەسەر هاتەكەم بدەن، لەسەرەتاوە لە بت نزیك تر بووم، ئیستاش لە خوا نزیك ترم، پابەندی پەیڕەوەكانم، رۆژ بە رۆژیش بە هێزتر دەبم، تێگەیشتم ئەگەر موسلمان لە زیاد بوون نەبی، ئەوە بیگومان لە كەم بوونەوە دایە، هیوادارم توانیبم تێتان بگەینم و لەمەبستم حالّی بن، بیگومان خوای گەورە لە بەندەكانی بێ ئومێد نابێ، هەتا بەندەكە بە خۆی بێ ئومێد نەبێ، جاتوخوا بێ ئومێد مەبن، بێ ئومێدی لە دلّتان جێ مەكەنەوە، نویژ پەیوەندی نیوان خواو بەندەیە كەوایە قەت پەیوەندیت لەگەل خوا مەپچڕێنە، زۆر تۆبە وئیستیغفار بكەن، خۆشەویستمان سەرەرای ئەو هەموو بێ تاوانیەی خۆی، رۆژانە زیاتر لە سەد جار تۆبەی دەكرد ودەگەڕایەوە، باش بزانن كە خوا لەكەس ناگۆڕێ گەر خۆی لە خۆی نەگۆڕێ. باش بزانن كە خۆشەویستی دنیا وترسان لە مردن گەورەترین گرفتارییە كە توشی دلّ دەبێ، هەروەها برا تیكۆشەرەكانمان لە فەلەستین وهەموو گۆشەیەكی دنیا لەبیر مەكەن، بۆیان بپارێنەوە خواش بەلّێنی داوە كە ستەم دیدەو چەوساوان هەر سەر بخات، كە دەفەرمووێ (سوێند بە گەورەیی خۆم هەر سەرت دەخەم ئەگەر پاش ماوەیەكیش بیت) هەتا پێشتان دەكرێ شت ومەكی جولەكەو ولاتە ستەمكارەكان مەكڕن مەپرسن بۆچی؟ ئیدی خوا خێرتان بنووسی و خێری ئێمەش بنووسێ.

# ﴿ لێك دابڕان ﴾

من ئافرەتێكی موسڵمانی ئاسایی بووم چاكەو خراپەم هەبوو، ماوەیەك نوێژم دەكرد، ماوەیەك دادەبڕام، لەسەر ئەوەش سووربووم كە منداڵەكانم لەسەر نوێژ بەردەوام بن، بۆ ئەوەی لە منداڵیەوە لەسەری ڕابێن وەكو من نەبن لەگەڵ ئەوەش من زۆر شتم لەسەر ئایین و لقەكانی خوێندبۆوە، بەڵام شەیتان نەفرەتی خودای لێ بێت كۆسپ بوو لەسەر پابەندی وبەردەوام بوونم، هەتا ئەو ڕووداوە ڕووی دا ژیانم بەتەواوی گۆڕا.

مانگی رەمەزان نزیك بۆوە موكوڕ بووم لەسەر ئەوەی كە نوێژەكانم بە ڕێك وپێكی بكەم بەكردەوەش دوو هەفتە ڕێك وپێك بووم، ئەوسا خوا ئەو راسپاردەیەی بردەوە كەباوكم بوو ئەویش مرد.

ئەو ڕووداوە هەموو گیانی هەژاندم، بۆ زانین باوكم پیاوێكی تەمەن (٧٧) ساڵە بوو، خوا لێی خۆش بێ، نەخۆش بوو، بەڵام ڕووداوی مردنەكەی تاساندمی و تووشی كۆستێكی گەورەی كردم، كە هەتا ئێستاش پێوەی دەناڵێنم وبۆ زانیاریتان باوكم سەردانی حەجی كرد بوو، كۆڵ نەدەر بوو لەسەر نوێژە فەرزەكان وسونەتەكان وقورئان خوێندن سوپاس بۆ خوا.

نازانم لەبەر چی لەپاش ئەو گۆڕام ئایا بۆ ئەوە بوو كە ڕووبەرووی خوا

نەبێتەوە کچەکەشی نوێژ نەکا یان ترسێك بەدوای دابچێ بۆ زانینتان لەسەرەتای مردنەکە زۆر خۆزگەم دەخواست کە منیش بە دوایدا (بمرم)، بۆ ئەوەی لەگەڵی بم، یانیش هۆیەکە ئەوە بووکە داوای ڕەحمەتی بۆ بکەم و قورئان بخوێنم و پاداشتەکەی بۆ بکەمە دیاری، بەڕاستی ناتوانم هۆکاری گەرانەوەکەم دیار بکەم، بەڵام زۆر سوپاس بۆ خوا، فەرزەکان وسوننەتەکان لە کاتی خۆیدا جێ بەجێ دەکەم، هەروەها ئەو شەونوێژ و تەسبیحاتەی دەیکەین لێمان قەبوڵ بکاو دامەزراومان بکا، هەروەها خوا پاداشتی مامۆستا:(عەمر خالید) بداتەوە کە لەیەکێك لە زنجیرەکانی رەمەزان باسی مردنی ڕۆڵەکانی پێغەمبەر ﷺ ی دەکرد، وێڕای ئەو هەموو خۆشەویستی یە گەورەی کە هەیبوو بەرامبەریان لەو کاتەدا وام هەست کرد کە مامۆستا:(عەمر خالید) وەکو ئەوەیە باسی گرفتاری و ڕووداوەکەی من بکا، کە ئەوەش قەزا وقەدەری خوایە، پێویستە پێشوازی لێ بکەین، پێی رازی بین، نەك بە غەم وپەژارە وشین وگریان، پێشوازی لێ بکەین، خوا پاداشتی بداتەوەو لەگەڵ ئێمەش نیمەش.

# ﴿ تۆوی چاکە ﴾

لەو کاتەی لە سەفەرێکی دوور دەگەڕامەوە، ڕێکەوتی خوا وابوو، جێگاکەم لەناو فڕۆکە لەتەنیشت کۆمەڵە گەنجێکی لاسار وبی ئاگا بوو لەو کاتە دا دەنگی قاقای پیکەنینیان بەرز دەبۆوە، زۆر دەنگە دەنگیان دەکرد، ئەو ناوەیان پڕی دووکەڵی جگەرە کرد بوو، لەدانایی خواش فڕۆکەکە پڕی خەڵك بوو هیچ کورسیەك نەبوو جێگاکەم بگۆڕم.

هەوڵم دا لەو تەنگژەیە دەربچم وبخەوم، بەڵام زۆر ئەستەم بوو.. کە یەکجار هەراسان بووم، دەستم بۆ قورئانەکە بردوو بەدەنگێکی نزم دەستم بە خویندنی کرد، زۆری پی نەچوو هەتا ئەو گەنجانە هەندیکیان هێور بوونەوەو هەندیکیشیان دەستیان بە ڕۆژنامە خویندنەوە کردوو هەندیکیشیان خەوتن، لەپڕ یەکێکیان لە تەنیشتم بوو بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد و گوتی: بەسە، بەسە!

وامزانی من بە بەدەنگی بەرز هەراسانم کردووە، داوای لیبوردنم کرد ئینجا دەستم بە خویندنی بە ئەسپایی کردەوە، بۆ ئەوەی بەس خۆم گوێم لیّ بێت، ئینجا دیتم یەکیکیان سەری خستۆتە نێوان هەردوو دەستی وخۆی لە دانیشتنەکە چەماندبۆوە، زۆر جوڵە جوڵی دەکرد ئەوجا سەری بڵند کرد وزۆر بە توڕەی گووتی: بەسە... بەسە، ناتوانم ئارام بگرم..!

ئەوجا لە کورسیەکە هەستاوە و ڕۆیشت ماوەیەك لیّم بزر بوو، دووبارە هاتەوە بە داخو پەشیمانییەوە سەلامی لێکردم، منیش بێ دەنگ بووم ونەمدەزانی چی ڕوودەدا، بەلاّم پاش کەمێك بێ دەنگی ئاوڕی لی دامەوەو چاوەکانی پڕ فرمیسك بوون، بەئەسپایی پێی گوتم: ئەوە سێ ساڵە یان زیاتر نێوچەوانم لەسەر زەوی دانەناوە ویەك ئایەتی قورئانم نەخویندۆتەوە..!

ئەوە ئیستاش مانگیکی تەواوە لەو سەفەرە دام وهیچ خراپەیەك نیە نەمکردبێ، کە دیتم تۆ قورئان دەخوێنی دنیا لەپێش چاوم ڕەش بوو، هەناسەم تەنگ بوو، هەستم بە خنکان دەکرد .. وام هەستدە کرد هەر ئایەتیك کە دەخوێنی وەکو قامچی بەسەر جەستەمدا دەکەوی..!!

لە دڵی خۆمدا گوتم: هەتا کەی ئەو بی ئاگاییە!؟ هەتا کوێ لەسەر ئەو کوێرەوەری یە بڕۆم؟!.

ئایا پاش ئەو گاڵتەو رابواردنە چ هەیە؟! ئەوجا هەستام چوومە ئاودەست دەزانی لەبەر چی؟! زۆر حەزم بە گریانیکی بە کوڵ کرد، هیچ شوێنێك نەبوو خۆمی لی حەشار بدەم، لەبەر چاوی خەڵکی مەگەر ئەوێ نەبێ!!

ئەوجا من چەند قسەیەکی گشتیم بۆ کرد دەرباری تۆبەو گەڕانەوە بۆلای خواو پەشیمان بوونەوە... ئەوسا بێ دەنگ بوو.

کە فڕۆکە کە نیشتەوە منی ڕاگرت، هەروەکو ئەوەی کە بیەوێ لە

دۆستەکانی دوور بکەویتەوە، پرسیاری لی کردم ونیشانەی رشتی تۆبە لە دەم وچاوی دیار بوو، گوتی: ئەریَ وا تیَدەگەی خوا تۆبەم لی قەبولْ بکات؟!

گوتم: ئەگەر لە تۆبەکەت ڕاستگۆ بی وموکورِ بی کە نەگەڕیتەوە سەری، خوای گەورە لە هەموو تاوانەکانت دەبووریَ.

گوتی: بەلاّم تاوانی زۆر گەورە گەورەم کردووە..!! گوتم: ئایا فەرمانی خوات نەبیستووە کە دەفەرموی: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ (الزمر)

واتە: ((ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بلّێ: خوا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم.. ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووە و هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا،چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بکەن، خوا لەهەر هەموو گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەو خوایە زۆر لێخوشبووە و لێبوردەیە و زۆر بەسۆز و میهرەبانیشە.)) (ت: ئاسان)

دیتم زۆر بە بەختەوەری پیَ دەکەنی وچاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوون، ئەوجا خوا حافیزی کردو رۆیشت..! پاکی و بیَ گەردی بۆ خوا..! مرۆڤ هەرچەندە بگاتە ئەو پەڕی خراپەو سەرپیچی وسەرەڕۆیی هیشتا

لەناو دڵی تۆوی خێر هەیە، ئەگەر توانیمان بیگەینێ و بێداری بکەینەوە و سەرپەرشتی بکەین ئەوە بە ئومێدی خوا بەر هەم دەدات.

بەڕاستی دەنکی خێر لە ناو ناخی مرۆڤ هەردەمێنێ وجوڵە دەکات، هەرچەندە پەردەی ئارەزووەکان دایپۆشی بێت، ئەگەر خوا چاکەی بەندەیەکی بووێ ئەوە لە ناو دڵی رۆشنایی هیدایەت دادەگیرسێنێ ودەیخاتە سەر ڕێگای تۆبە کاران.

خوا دەفەرموێ: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢٥﴾﴾ (الأنعام)

واتە: ((هەرکەسیك خوا بیەوێ هیدایەتی بدات ئەوە دڵی دەکاتەوە بۆ ئیسلام، وە هەرکەسیك خوا بیەوەی گومڕای بکات ئەوە سینەی تەنگ وتاریك دەکات وەکو ئەوە بەسەر ئاسمان هەڵبگەڕێ.)) (ت"ئاسان)

# ﴿ جگەر گۆشە ﴾

پیاو چاکێك گرفتاری منداڵەکانی ببوو، هەرجارێ منداڵەکی دەبوو پێی دڵخۆش دەبوو، بەڵام مەرگ دەیبردەوە،بە غەمباریو دڵشکاوی دەیهێشتەوە،بەڵام پیاوەکە لەبەر پتەوی باوەڕی هیچی بەدەست نەبوو تەنیا دڵی بەخوا خۆشبکات و بەئومێدی پاداشتی ئەو هەموو جارێك دەیگوت: (لله ما أعطى ولله ما أخذ أللهم أجرني في مصيبتي واخلفني خيرا منها)

واتە: ((هەرچی خوا بیدات یان بیباتەوە هەر ئی خۆیەتی، خوایە گیان پادشاتم بدەوە و دوای کارەساتەکەم چاکترم پێ ببەخشە)

هەروا بەردەوام بوو هەتا منداڵی سێ یەمی، دوای سێ ساڵ ئەویش نەخۆش کەوت ونەخۆشیەکەی گران تر بوو، کەوتە سەر لێواری مردن وباوکە داماوەکەی لە دیاری فرمێسکی دادەباراند... سەرە خەوێك بردیەوە، لە خەونی دیتی کە قیامەت دا هاتووە... نەهامەتیەکانی قیامەت دەستی پێکرد وپردی (صراط)ی دیت ئامادە کرابوو، واخەڵکی بەسەری دا تێدەپەرن وکابرا خۆشی دیت والەسەر (صراط) ەو دەیەوی رەت بێ زۆر ترسا رزگار نەبێ، ئەوجا دیتی منداڵەکەی هات و پێی گوت: بابە گیان من یارمەتیت دەدەم ودەستی بەڕۆیشتن کرد، بەڵام ترسا لەوەی

ئەوەك بە لایەکی دا دی بکەوێ، لەوێش دیتی منداڵەکەی دووەمی مردووی هات ودەستی گرت، کابرا بەوە زۆر دڵخۆش بوو، پاش ئەوەی کەمێك تێپەری زۆر تینووی بوو، داوای لە منداڵێکی کرد کە ئاوی بداتێ، بەڵام گوتی: نەخێر ئەگەر یەکێکمان بەرت بدەین دەکەویە ناو ئاگر چی دەکەی؟

منداڵەکەی دیکە پێ گوت: بابە گیان ئەگەر برای سێیەمان هەبایە ئەویش ئێستا بە ئاو فریات دەکەوت...!

ئەوجا کابرا لە خەونەکەی بە ترس ولەرزەوە خەبەری بۆوە، زۆر سوپاسی خوای کرد لەسەر ئەوەی کە ئەو هێشتا لە دنیا یەو دنیای لێ دانەبڕاوە، هیشتا قیامەت نەهاتووە، ئاوڕی داوە لای کوڕە نەخۆشەکەی دیتی هەناسەی لی براوەو گیانی سپاردووە، هاواری کرد سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تۆی بۆمن کردە پاداشت وتوێشوی دوا رۆژم بۆ رزگار بوونم لەسەر پردی(صراط) مردنەکەی زۆر ئاسایی بوو بەلایەوە، ئەویش لە ئەنجامی ئەو ئارامگری وزیکرە پیرۆزەی کە دەیگووت لە کاتی لێ قەومانداو خواش ئەو راستیەی پێشان دا. مردنەکەشی زۆر بەلاوە ساردو سەلامەت بوو.

***خوا ئارامیو خۆگری بە ئێمەش ببەخشێ.***

# ﴿ ئازاری گوێ ﴾

کچەکە لەدوای نوێژی خەوتنان لــە ژوورەکــەی خۆیــدا دانیــشتبوو، خەریکی خولیای ڕۆژانەکەی بوو، خۆشترین کاتی پێ ڕادەبوارد، بەتەواوی ئاگای لەدنیا دەبڕا...ئەویش گوێ دان خۆشترین ئاوازی گۆرانی بوو، ئــەو گۆرانی بێژە پەسندترین گۆرانی بێــژ بــوو لــەلای، کەهێــدفۆنی دەخــستە گوێچکەکانی شای بەسەپان نەدەزانی، هەموو چرپەو بانگی دەخستە پشت گوێ بەتەواوی لە دنیای فانی دادەبڕا، ئامۆژگارییەکانی پــیرە دایکێکــی قــەمبوور بــەهۆی ئاســتەنگەکانی ژیانــەوە فــەرامۆش کردبــوو، کاتێــك دەیگوت: نەفرەت لە شەیتان بکە... شەوەکەت بــە دوو ڕکــات نوێــژ بــۆ خۆاکۆتایی پێ بێنە لە جیاتی ئەو گۆرانیانە... وەلاٌمی دامــەوە بــە دڵــە ڕاوکێ: ... باشە... باشە, دایکەکە چوو بۆ نوێژ کردن و دەستی بە شەو نوێژ کرد، زۆر بە وردی دیقەتی دایکیدا، ئــەوجا گۆرانیەکــە تــەواو بــوو، لەسەر پێخەفەکەی بە نیگەرانیەوە ڕاکشا ودانیشتەوەبۆ ئەوەی بە خۆشــی خۆی ئامادە بکات بەدەم گۆرانی بەدەنگی خۆی بخەوێ.. پرچی کــردەوە.. هێدفۆنەکەی لەســەری هێنــا خــوارێ، ســەرنجی پەنجەرەکــەی دا.. ئــۆی.. کراوەیە پێش ئەوەی بچێ دایبخا شتێك وەکو تــیر بــەرەو ڕووی هــات زۆر بەوردی بەرەو ئامانجەکەی چوو کە دەیویست بی پێکێ، ئامانجی لەپەردەی

گوێی گرت... لەتاو ژانی گوێی زیڕاندی... هەستا وەکو شێت ودێوانە بەدەوری خۆی دا دەسوڕایەوە.. هاشە هاشێك کەوتە ناو گوێی.. خشەخشە لەناو کەلەی دەهات، دایکەکە بە ترس ولەرزەوە هات.. کچم ئەوە چیتە.. بە خێرایی برووسك چونە نەخۆشخانەی فریا کەوتن دکتۆرەکە گوێی پشکنی.. بانگی سستەرەکانی کرد.. لەو کاتە دا کە لەو پەری ئازار بوو دکتۆر وسستەرەکان کەوتنە قاقای پێکەنین، کچەکە دەستی بە جوێندان ونەفرەت و.. قسەی ناشرین کرد پێی گووتن: چۆن پێدەکەنن کە من لەو پەری ئازار دام دکتۆرەکە پێی گوت: سیسرکەیەکی باڵدار چۆتە ناو گوێت، مەترسە بەئاسانی دەردێ، بەلام ئێمە ناتوانین دەری بێنین پێویستە بچیتەوە ماڵەوە بەیانی سەعات حەوت بێیتەوە، لای پزیشکی پسپۆر، چۆن بچێتەوە لەو کاتەی سیسرکەکە جوڵە جوڵێتی و دەیەوێ لە گوێی دەرچێ! چرکە بەچرکە ئازارەکانی زیادی دەکرد، دکتۆرەکە گووتی: ئیستا هەر ئەوەندەمان پێ دەکرێ، سیسرکەکە هەتا بەیانی سڕ بکەین بۆ ئەوەی نەجوڵێتەوە، مادەیەکی سڕکەری لە گوێی کرد، لێرەدا ئیشەکەی دوکتۆر تەواو بوو.

وەکو شێت بردیانەوە، سەری خەریك بوو دەتەقی لەئێش و ئازارێکی توند، ئەو شەوە هەتا تێپەری بەدرێژایی سەدەیەك بوو، هیشتان نوێژی بەیانی تەواو نەببوو، لەگەل دایکی بە خێرایی چوونەوە نەخۆشخانە...کاتێ پشکنینی بۆ کرد... قسەی دکتۆری ئیوارە

دەرنەچوو.. دەرهێنانی سیسرکەکە ئاسان نیـە، پارچـە لۆکەیـەکی سـپی ئامادەکرد بەمەقەس رەوانی گوێی کرد.. ئەوجا دەری هێنا تـەنیا کلکـی سیسرکەکە بوو.. دووبارەی کـردەوە سـینگی.. ئـەوجارە پـەلی.. ئـەوجا سەری.. بەڕاستی سیسرکەکە چرنوکی لە پەردەی گوێی گیر کردبـوو، زۆر ئەستەم بوو دەر بێ چونکە تێچەقیوە! دکتۆرەکە مادەیەکی پاککـەرەوەی بە لۆکەکە کرد وخستیەوە ناو گـوێی، پێـی گـووت: پـاش (٥) رۆژی تـر وەرەوە بەشکو پاش مردنی سیسرکەکە چرنووکی بڕزێتەوە، لەماوەی ئـەو پێنج رۆژەدا، هەستی بیـستنی لاواز دەبـوو، کـچەکە ئەوەنـدەی دەزانـی لێویان دەجولێتەوە، ئەویش نەیدەزانی چی دەڵێن وتێیـان نەدەگەیـشت .. خەریك بوو شـێت بێـت، ئـەوجا هاتـەوە دکتـۆرە کـە هەوڵیـدا بـەڵام.. بەداخەوە هیچی پێنەکرا.. دووبارە پارچە لۆکەکەی خستە ناو پاککـەرەوە خستیەوە گوێی.. برۆ پاش (٥) رۆژیتر وەردەوە.. دەسـتی بـەگریان کـرد.. هەستی بە پەشیمانی کرد.. لە هەموی ناخۆشتر ئـەوە بـوو کـە دەیـدیت هەمو یان قـسە دەکـەن و پێدەکـەنن ئـەویش هیـچی گـوێ لێ نـەدەبوو نەیـدەتوانی وەڵامـی قـسەکانی دەووری بـەری بداتـەوە.. پـاش (٥) رۆژ هاتەوە.. دیسان سوودی نەبوو، پێویـستە نەشـتەرگەریت بـۆ بکـرێ بـۆ دەرهێنانی چرنوکەکە خەریك بوو لە خەم و دەترسان زەندەقی بچێ، داوای لە دکتۆرەکە کرد کە (٥) رۆژی دیکە مۆڵەتی بـداتی، ئـەوجا پـاش (٥) رۆژ.. خوای گەورە ڕەحمی بەدەرباز بوونی کـرد ودکتۆرەکـە تـوانی بـەبێ

نەشتەرگەری هەردوو چرنوکەکە دەربهێنێ و ئەوجا هێدی هێدی بیستنەکەی بۆوە.. تەنیا لەوێوە... تێگەیشت کە هەموو ئەوەی بەسەری هاتووە وەکو تیشکێك وابوو کەوا لە بێ ئاگایی وخوا نەناسی ڕاپەڕاند وگێڕایەوە بەرەو خوا.. ئێستاش لە کاروانی تۆبەکاران دایە.. لە خوا دەپاڕێمەوە ئێمەو ئەویش دامەزراو بکات لەسەر ڕێبازی ئەو کاروانە پڕشکۆیە... کاربەجێی هەر بۆ خوایە.

# ﴿ ئەزموونێکی سەیر ﴾

هەرکە وشیار بوومەوە خۆم لە لیژنەی تاقی کردنــەوە دیتــەوە، ئــەو تاقی کردنەوەی پاشە رۆژم پیوەی بەند بوو.. ئەی خوایە.. چارەنووسم .. ئەو وشانەم چەندان جار دووبارە کردەوە.. تەماشای لاپــەرەکانی پرســیارم کرد هەرکە چاودێرەکە لە پێشی دانام بەڵام بە وردی سەرنجم نەدا.. وەکــو ئەوەی کە پرسیارەکان زۆر ئاسان بووبێ یان لە ســەرەتاوە وای بــۆ چــووم، ئەوجا لەسەرەتای پرسیار تا کۆتــایی هــەمووم خوێنــدەوە، تیبینــیم کــرد کاتی دیاری کراوی تێدا دیار نــەبوو، لەگــەل هــاتوو هــاواری ئــەوانی دی پێکەوە بانگمان کرد.. (کوا چاودێر؟؟ کوا چاودێر؟؟)..

ئەوە هەڵە نیە بــەڵکو کــاتی دیــاری کــراو نیــە بــۆ تــاقی کردنــەوە چاودێرەکەش گوتی: ئەوەی لەسەر تۆیە وەڵام بدەوە، ئای چەند قــسەیەکی رەق بــوو، چارەنووســم لەســەر ئەوەیــەو ناشــزانم کاتەکــەی چــەندە، لەرێنمایەکانی سەری نوسرا بوو، بە گوێرەی توانــای خــۆت وەڵام بــدەوە، لەســەر بنــچینەی کــاتی وەڵامدانــەوە بــۆت حیــساب دەکــری.. دڵنیــا بە..ستەمت لی ناکرێ هاوکاری لەگەل خاوەن بیر وراکــان لــە ئەنــدامانی دەرس گوتنــەوە بکــە، وێــرای کتێبــی قوتابخانــەو تــەواوی سەرچــاوە، ئامیلکەکان، ئەی خوایە ئەو ئاسان کاریانە چەند خۆشن، تەنیا مەرجێکی

جـەرگ بـڕی تێدایـە ئـەویش هـەر کاتێـك لاپەڕەکـەت لیٚ بـستێنەوە دەیستێننەوە، کەس شك نابەم بێجگە لە خوا، ئەی خوایە ئـەی دڵگـۆڕی دڵان، ڕاگیراوم بکە لە کارەکەم بۆم ئاسان کە، هەوڵم دا بە وردی سـەرنجی بدەم و....دەست پێبکەم، ئاوڕێکم لە دەور وبەرم داوە.. زۆر شـتی سـەیرم دیـت، هەنـدێك کـەس هـەبوون هـیچ بایـەخیان بـە وەلاّمەکـە نـەدەدا، هەندیکیشیان گاڵتەیان پیٚ دەهات وبەفشەیان دادەنا، کەسـێکی دی لـەو لاوە دەیخوێنـدەوە و پێدەکـەنی ودەیگـوت: (لـێم گـەڕێ ... ئـەو خـۆش بەختییە ناگەڕێتەوە)!

دیتم هەندێك شت هەیە چێژی لیـوەردەگرم.. ئـاوڕم داوە، بەراسـتی ئەویٚ خۆشەویستم بەشداری لیٚ بکەم، بەڵام هاواریکی گەورە رایچلەکاندم کەهاتوو هاواری برادەرێکی تەنیـشتم بـوو: (هێـشتا هیـچم نەنووسـیوە) بەفشەی برادەرەکەم سەر قاڵ بووم، نەمدەزانی ئێوە لـە جێبـەجیٚ کردنـی رینمایەکان ئەوەندە سوورن، توخوا لاپەڕەکەم بـدەوە پاشـە رۆژم بـە فـیڕۆ دەچیٚ، ئای لەو ترس ولەرزە کاغـەزی وەڵامـەکەم وەرگرتەوە، خـۆم گـوورج کردەوە، هیشتا هیچم نەنووسی بوو، هەوڵم دەدا بـە وردی سـەرنج بـدەم، بەڵام دەنگە دەنگی دەور وبەرم هەراسانیان کرد بووم، خۆزگەم دەخواسـت کەلەو جیگایە دانەنیشتبام.. دەستم بە چاوگێران بە ناو هۆڵە کـە کـرد.. دیتم کۆمەڵێك لەسەر خـۆ و بـە هیمنـی دانیـشت بـوون زۆر بـە بایـەخ وبەپەرۆشەوە وەلاّمیان دەدایەوەو هاریکـاری یـەکتریان دەکـرد، ویـستم

بچمە ناویان بەلاَم چونکە گالتّەیان پیّ دەکرا دوودلّ بووم، کاتەکەش هەر تیّدەپەڕی.. هەرچرکەیەکیش بۆی هەبوو لاپەڕەکەم لیّ بسەندریّتەوە، بە دانایی هەستامەوە لاپەرەوخامەکانم هەلّگرت وپیم گوتن: ئەریّ لەگەلّ خۆتان وەرمدەگرن، هەموویان بەروو خۆشی ئاوریان داوە وبەدلّخۆشیەوە: (بە خیّر بیّی بۆ ناو گوروپی سەرکەوتووەکان پشت بە خوا) هەر زوو لەناو خۆیان جیگایەکان بۆ کردمەوە دەستیان بە یارمەتی دانم کرد، منیش هەر ئەوەندەم زانی خۆم بە هیّمنی ودلّنیایی دیتەوە، دەستم چووە سەر خامەو و وەلاّمدانەوە بە ئاسانی.. بەلاّم چاودیّرەکە لە هاوریّکەم نزیك بۆوە، کە لە تەنیشتم بوو لاپەڕەکەی لیّ وەرگرتەوە.. منیش دلّم بۆی تەنگ بوو، بەلاّم دیتم بە پیّکەنینەوە هەر زوو لاپەرەکەی داوە دەستی وگوتی: (ئەوەی لە توانام دابوو پیّم کرا کەمتەرخەمیم نەکرد ودلّنیاشم لە دادوەری ومیهرەبانی پشکیّنەر... بەردەوام بن وهەولّبدەن.. ئیستاش چاوەریی دەوری من بکەن. دەنگیك بە ئەسپایی بە گویّی دا چرپاندم : ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾﴾.

واتە:((وادەزانن هەروا بیّ هودە دروست کراون، بۆ لای ئیّمەش ناگەریّنەوە؟.))

# ﴿ کچۆڵەیەکی بەهەشتی ﴾

دەستە خوشکێکم، فرمێسکی لە چاوانی دەهاتە خـواریٚ ودڵـم بـۆی دەسوتا گێڕایەوە گوتی: باوەڕم بە پزیشکی منالأن نەکرد و پـشت گـوێم خست کە گوتی: گوایە مندالەکەی من پەککەوتەیە، نکوولیم لەقـسەکەی کردوو باوەڕم پێنەکرد، بۆیـە هەسـتام کـچەکەم بـردە لای بـەناوبانگترین نوژدارە جیهانیەکان لەوێش هەمان هەوالیان دامێ، وەکو هـەورە تریـشقە کەوتە سەر دلم.

کچەکەم لە جەستە پەککەوتە بوو کەم ئەقلٚ بـوو، بۆیـە تووشـی بـێ ئومێدیەکی گەورەو خەمناکییەکی زۆر بووم وکەوتمە شـەوانێکی تـەنگ، وام لێهات هەر لەحالی کـچەکەم بیربکەمـەوەو دنیـا لەبـەر چـاوم گـۆڕا بەدنیایەکی دی، وام لێهات دنیا بەهیچ نـەزانم وهەسـت بـەگوناه بکـەم، لەبەر ئەوەی من هەوالی مەلۆتکەکەی ناوسکم بەتوڕەیی وگریان وەرگرت، (چونکە پێی ڕازی نەبووم) ڕەنگە ئەوەش سزایەك بێ کە تووشـی ببـووم، ئینجا هەولم دا کە خەم فڕێ دەمە ئەولا ودەستم کـرد بـە پرۆفـە کردنـی هەندێك شارەزایی کە بەکەلك ژیان بێت، بەلأم بەراستی کچەکەم تووشـی خراپترین پەککەوتەیی هاتبوو لەبەر ئەوە ئەو پرۆڤانـە هیـچی بەکـەلکی نەدەهات.

ئینجـا بـێ ئومێدیـەك خـەریك بـوو دلـی دەتەنیمـەوە، گـیرۆدەی پەژارەیەکی قوولٚ بووم و خۆم و مالٚ و منـدالـم پشت گویٚ خست، هەسـت

ونەستی نالەبار وێرانیـان کـردم، هـەتا وام لیهـات لەدەسـت بـیری نـامۆ دەمنالاند، تەمبەڵی و بێزاریو بەڵکو ڕەشبینی لە ژیانم، گۆشـە گـیری و دڵەراوکێ سەیر وئازاردەر بوو، ئەوە چـی بـوو کـە تووشـی بیرکردنـەوەی نالەبار و دڵە راوکێ و فەرامۆش کردنی ماڵ ومنـداڵی کـردم؟.. خـەڵکی ئیرەییان پێ دەبردم لەسەر ئەو نازو نیعمەتانەی کە خوا پێی بەخـشیبووم، تووشی چاوەزار بووم گووتم دەبێ بە دوای مامۆستایەك دابگەڕێم بەسـەرم دا بخوێنێ،.. بۆچی ئەچمە لای(فلان) کە هەموو خەڵکی بە چـاکە باسـی دەکەن... هەستام چوومە لای ئافرەتەکەو پاش ئەوەی بەسـەریدا خوێنـدم گوتی: خوشکم تۆ توشی چاوەزار نەبویتـە، بـەڵکو توشـبوونەکەت لەبـەر کەمی بڕوایە، خوایەمن بڕوام لاوازە!.. نەخێر من موسڵمانێکی نوێژکەرم، خوشکێ بەراستی ئەوەی تۆ پێوەی دەناڵێنی هۆکارەکانی دووری لە خـواو بی هێزی ئیمانە، ئەگەر دەتـەوێ لێـی رزگـار بـی بـەرەو خـوا بگـەڕێوە وتۆبەیەکی راستەقینە بکە، دڵت بەخۆشەویستی خوا پڕکـەو خـوا بـەتاك یەکلاکەوە، ئایا دەزانی یەکلایی کردنەوە چیە؟ راسـتگۆ بـە لەگـەل خـوا وڕێك وپێك پەرستن و پەنا بۆ بردنیەتی و بەخشوع نوێژ بکەو بە نیوە شەو خەوت بتورێنەو شەو نوێژ بکە، بۆ خوا بەرۆژووبەو داوای زانیاری بەسوود بکەو بەبەشی خۆت ڕازی بەو ئارام بگرە... ئۆف.. بـەخوا راسـت دەڵێـی مامۆستای دڵسۆز پێویستە ئارام بگرم وبەقـەزا و قـەدەری خـوا ڕازی بم، لەو رۆژە وە دەستم کرد بە پـەیڕەو کردنـی ئـەو رێبـازە بـۆ خـوا بوومـە

بەندەیەکی تۆبە کار وقورئان بووە یاوەڕم لەگرفتاریم وزیکر بـووە توێـشوو لە تەنیایی ونوزانەوە لەبەر خوا بووە چێژی ژیانم، چەند رۆژی نەبرد هەتا تەمی خەمەکانم ڕەویەوە وپڕشنگی ئیمان لە دڵم دەدرەوشایەوە، ئای چەند شیرین بوو کەمن پێشتر نەمناسی بوو تامم نەکرد بوو.. بەراستی بێتامی ژیانم گۆڕا، بەچاوی ئیمان دیتم، بەنزیك بوونەوە لە خوا ژیان شـیرین وبـە تامە.. هەستی ڕق وکینە بەرەو ڕەزا بـوون بەقـەدەری خـوا گـۆڕا ئـەوجا تێگەیشتم ئەوەی تووشی ببووم دەبوایە هەر وا بێت، بـەوە دەروونم هێـور بۆوە ودڵـم ئاسوودە بوو، هەستم بە نقووم بوون کـرد لـە ئاسمـانی ئیمـان وزانستی شەرعی، بەبیری خوا یەقیندارببووم کە مەرج نیە گرفتەکان تـەنیا سزای خوا بن، بەڵکو ڕەنگە بۆ بەرز بوونەوەی پایەی مرۆڤ بن، یان تـاقی کردنەوەی خوا بێ، بۆ ئەوەی وەکو زێڕ پاکبێتەوە ئەوەش بەخشـشی خـوا بوو کەلەگەڵە منی کرد ویارمەتی دام بۆ کردنەوەی فێرگەیـەکی تایبـەتی پەروەردەکردنی پەککەوتە شڕەکان، بەوەش سـوودم گەیانـدە موسـڵمانان، هەرچـەندە کـچەکەم کـاتی خـۆی سـوودی لـێ نـەبینی، لەبـەر ئـەوەی پەککەوتەیەکەی سەخت بوو، بەڵام من بەختەوەرم کە موسـڵمان سـوودی لێ ببینن، داواش لە خوای گەورە دەکەم کە لێمان وەربگـرێ... ئیـستاش هەرچەندە لە ماڵەکەمان کچە پەککەوتەکەم دەبینم، سوپاسی خوا دەکـەم لەسەر ئەوەی کە(لەماڵەکەمان کچۆڵەیەکی بەهەشتی هەیە).

# ﴿ ڕێگایەکی ڕۆشن ﴾

پێم خۆش بوو سەر گوزەشتەی خۆم بخەمە ڕوو، لەکاتێك دا بۆ هەندیك کەس ڕەنگە هاندەربێت، تا بەرەو ڕێگای ڕۆشن بچن، من کچێکی زۆر ئاسایی بووم بالاّ پۆش نەبووم، بەلاّم ڕەچاوی داب ونەریتە گشتیەکانم دەکرد لە پۆشین دا، بۆیەی مکیاج کردنم بەکار نەدەهێنا، مەگەر بەدەگمەن نەبێ، هەمیشە شوێن کەوتەی سوننەتی پێغەمبەر بووم، هەولّم دەدا لەڕەوشت جوانی پابەند ترین کەس بم، بالاّپۆشیم نەدەکرد نەکو لەرۆژی بوکێنیم هەلّبگەرێمەوە، هەرچاوەڕێم دەکرد هەتا شوو بکەم، چەندان سالّ تێپەری هەر شووم نەکرد وبیروڕام وابوو کە هیچ کەم وکوریەك لە بڕوام نیە تەنیا بالاّپۆشیم نەبێ، ئەوەی لەخەلّکیش دەمبیست بەرامبەر خۆم هەر پێداهەلّدانم بوو، لەسەر ڕەوشت و ئاکاری جوان، دژی دنیا پەرستی بووم، قەت درۆم نەدەکرد، هەرچەندە بارودۆخ ناچاریان بکردبا، زۆربەی ئەوانەی دەیانناسیم، شانازییان پێوە دەکردم وێڕای ئەوەی بالاّپۆشیش نەبووم.

هەستم دەکرد بەراستی خوا منی خۆش دەوێ، چونکە زۆر جار خەونی چاکی پێ نیشان دەدام، بەتێپەر بوونی رۆژگار هەستم بەشەرمەزاریەکی زۆر بەرامبەر خوا کرد، چۆن پیسکەیی بکەم بەرامبەرخوا پەرستی، شەرم

لە خەڵك بکەم وشەرم لەخوا نەکەم، خەونێکم دیت تێدا خەڵکیم بینی بوونە دوو کۆمەڵە، خەڵکی موسڵمان وخەڵکی بێ ئاگا لە ئایین منیش لەم نێوانە دا سەرسام ببووم، موسڵمانەکان دەیان ویست بچمە ناویان، ئەوەش بۆمن بەڵگەی تێپەربوونی تەمەن بوو، ئەو خەونە بۆمن دووجار دووبارە بۆوە، خوشکەکەم مارە کراو بڕیاردرا لەجەژنی رەمەزان بگوازرێتەوە، منیش بەڵێنمدا بالاپۆش بکەم، بەڵام هەموویان بە منیان گوت: دوای شوو کردن بۆ ئەوەی جوانترین جل وبەرگ لەبەر بکەم وبەجوانترین شێوە دەربکەوم، بەڵام خەونێکم دیت لەبەسەر چوونی تەمەن، لەخەو ڕاپەریم دەستم بەگریان کرد، پێش ئەوەی برۆمە سەر کارەکەم دوو دڵ بووم یەقینم وا بوو ئەگەر لە ماڵەوە دەرچم دەمرم بەبێ ملکەچی فەرمانی خوا، بەڵام لەوە دەترسام کە بگەمە دیداری خوا بەسەر کۆتی وسەر پۆشم لەسەر نەبێ، ئەوجا سەر پۆشێکم لەسەر کرد هەر لەماڵەوە بەراستی جوان بوو، ئینجا لەسەر ئەوە بەبێ باکی دەرچووم بێ منەت بووم ئەگەر بشمرم، ئەوجا بۆ گواستنەوەی خوشکەکەم جل وبەرگێکی جوانم پۆشی و سەر بڵند بووم پێی، ئەوێ ڕۆژێ زۆر بەختەوەر بووم پێی، بە خوشکێکم گوت چەند سەر پۆشێکم بۆ بنێرێ هەتا دەیان کڕم، ئەو سەرگوزەشتەیەش لە دوا ڕۆژەکانی کۆتایی مانگی رەمەزانی ڕابردوو بوو، سوپاس بۆ خوا ئەو ئەرکەم جێ بەجێ کرد، ئەوەندەی کەوا لێی پەشیمانم و زۆریش پێی شەرمەزارم ئەو ڕۆژگارەیە کە بەسەرم دا تێپەری بەبێ

حیجاب وخەمم لیّ نەدەخوارد، جا داوا دەکەم لەھەر کچێك تا ئیستا رێگای رۆشن نەدۆزیوەتەوە ئەویش بێتە سەر ئەم رێگایە.

ئازیزەکەم ئەی ئەو کەسەی کەوا دوودڵی لە نێوان دوونیا ودوایی بگەرێوە سەر رێگای رۆشن  بێگومان یارمەتی لە خواوە دەدرێیت.

دەستە خوشکەکەم گوتی: زۆر پێم خۆش بوو، بەتەمابووم منیش بێم وداوات لێبکەم بۆ بالاّ پۆشین، بەلاّم لەناکاو سەرسام بوو کە گوتم: ئەوە ماوەی هەفتەیەکە پۆشیومە، ئەوجا پیرۆزبایی ودەستخۆشی لیّ کردم و گوتی: بێگومان لەرەمەزانیش پاداشت وخێرت زیاترە لەهەموو کاتەکانی تر.

چیرۆکێکی خۆشم خوێندەوە: دەگێرنەوە رۆژێك پیاو چاکێك بەدوای دارەبازەی مردوێکدا دەرۆیشت وکابرایەکی لەتەنیشت دەرۆیشت پێی

گوت: ئەگەر ئەو مردووە بگەرێتەوە دوونیا کاری چاکە دەکات؟

کابراش گوتی: بەلیّ...پیاو چاکەکەش وەلاّمی دایەوە گوتی دەکەوایە ئەگەر ئەو نەشگەرێتەوە خۆتۆ هێشتا لێرەی!...

هەلی ژیان بقۆزەوە هەر چاکەیەکت پیّ دەکریّ، بیکە لەخێرو شەونوێژو زیکر...هتد  چونکە رەنگە رۆژێك بێتە پێشەوە، پارەت نەبیّ بیبەخشی، توانات نەبیّ بۆشەونخوونی، کیّ دەزانی ئایا دەگەینە ئەورۆژەی کەوا قەرەبوومان پێبکرێتەوە یان نا.

پاش بالاّ پۆشیشم هەر لەسەر رێبازەکەم بەردەوامم ودەزانم هێشتا

بڕوام زۆری دەویّ و هێشتا نوێژەکانم وەکو پێویست نیەو هێشتا لەسەرمە لەسەر ڕێگاکەم بەردەوام بم لەچاکەکاری بەرامبەر دایك وباوكو دووزمانی وباسی خەڵك نەکردن، هەروەها بالاّ پۆشیەکەم هێشتا پێویستە چاکتر بکەم بۆنەوەی وەرچەرخانێکی بنەڕەتی ڕووبدات لەژیانم دا.

بەڵێ، بەلاّم هەموو سووربونم ئەوەیە کەوا لەسەر ئەم ڕێبازە ڕۆشنە بەردەوام بم، کەبەدوا ئاواتەکانم دەگەم ئەویش دیداری خوای گەورەیە کەنووری ڕاستەقینەیە.

خوایەگیان لێم قەبووڵ بکەو سەرکەوتووم بکەو هەر کەسێکیش سەرکەوتوو بکە کەبەئومێدی دیداری تۆیە ولەسەر ئەم ڕێگایەو پەرستشی خۆت دامەزراوی بکە، خوایە ئەی دڵگۆڕ دڵم مەگۆڕە پاش ئەوەی هیدایەتت داین، میهری خۆت پێمان ببەخشە هەر خۆت بەخشندەو ڕێ نیشاندەری.

# ﴿ یەکێك لەدوو حاڵەتەکان ﴾

کچێك لەتەمەنی (٢٠)ساڵی بەکارەساتی ئوتومبێل کۆچی دوایی کرد.... پێش مردنی بە ماوەیەکی کەم کەس وکاری لێیان پرسی: چۆنی (فلان..! گوتی: سوپاس بۆ خوا باشم).

بەڵام پاش ماوەیەکی کورت مرد خوای لێخۆشبێ.

هێنایانە سەر مردوو شۆر لەسەر مردوو شۆرەکەمان دانا دەستمان بە شوشتنی کرد کەسەرنجمان دایە رووخساری دیتمان دەدرەوشایەوە وزەردەخەنەی لێ دەباری، وەکو ئەوەی لەسەر جێگاکەی... نوستبێ هەروەها هیچ شکان وبرین وخوێن پرژانی نەبوو هەروەکو (دایکی ئەحمەد) کە مردوو شۆر بوو گێرایەوە: کاتێ هەڵمان گرت بۆ تەواو شوشتنی دیتمان مادەیەکی سپی لە لوتی دەرچوو ژورەکەی پڕ بۆنی میسك کرد! سبحان الله! بەراستی بۆنی میسك بوو، دەستمان بە الله أکبر کردو زیکرمان کرد... کچەکەم دەستە خوشکی بوو، دەستی بە گریان کرد بۆیی، پلکی کچەکە پرسی ئایا خوشکە زاکەی لە ژیانی چۆن بوو؟ چی دەکرد؟

گوتی: قەت فەرزێکی نەچوواندوە لە وەتەی خۆی ناسیوە... قەت تەماشای فیلم و زنجیرەی تەلەفزیۆنی نەدەکرد و گوێی نەدەدا گۆرانی، لەوەتەی تەمەنی گەیشتۆتە (١٣) ساڵی هەموو دووشەمەو پێنج شەمان

بەرۆژوو دەبوو ونیازیشی وابوو دەست بـە مـردوو شـۆردن بکـات، بـەڵام کەسی نەشوشت خۆی شۆردرا.... مامۆستاکانی ودەستە خوشکەکانی بـە باسی خواناسی و ڕەوشـت جـوانی ئـەو کـچۆڵەیە وکاریگـەری کـرد بـوو لەمامۆستا وهاوڕێکانی لە کـاتی ژیـانی ولـە دوای مردنیـشی... بـەڵام بەدبەختێکی دی کۆتایەکەی خراپ بوو، دایکی ئەحمەد گێرایەوە: ڕۆژێـك کچێکی (١٧) ساڵی مردوو ئامادەیان کـرد بـۆ شـۆردن... خوشـکەکانی دەیان شوشت.. ئێمەش تەماشامان دەکرد جەسـتەیەکی سـپی هـەبوو... بەڵام زۆری نەبرد ورەش هەلگـەڕا وەکـو تاریکـە شـەوی لێ هـات، خـوا دەزانێ بەحاڵی.

پاشان نەمانتوانی پرسیار لە کەس وکاری بکەین، هەتا نەیان ترسێنین وشتەکەمان داپۆشت، خواش هەر خۆی بەندە دەناسێ، لە خوا دەپاریـەوە سەلامەت ودوا ڕۆژمان خێر بکات.

ئایا خوشکێ لەو دوو بەسەر هاتە پەند و وانـە نـابینی؟ ئایـا شـوین کەوتەی چاکە دەبی؟ یان سەماکەرو دوو ڕووەکان پێشەنگت دەبن؟

بەدەست خۆتە کامە حاڵەت خۆزگەی پێدەخوازی!؟.

# ﴿ ڕێگای هیدایەت ﴾

سەرنجمدا کارو بارێکی زۆر هەبوو، هێدی هێدی بەرەو هیدایەتی دەهێنـام لەو کاتەی کچێکی دیـن لاواز بـووم، ڕۆژێـك نوێـژم دەکـرد دەیـان ڕۆژ نەمدەکرد ونوێژی بەیانیم دەچوو، هەتا گێرانەودشی بەخەیالّم دانەدەهات، قەت قورئانم نەدەخوێند تەنیا لە ڕەمەزانان نـەبێت، وام دەزانـی ڕەوشـت جوانی ورەفتار چاکیم لەگەڵ خەڵکی بەسە بۆ لێ خۆش بـوونم، کـارم بـەم شێوەیە دەڕۆیشت و بێ ئاگا بووم، وامزانی کە من ڕاستم هەتا لـە سـاڵی ڕابـووردوو نەخۆشـکەوتم بـە نەخۆشـیەکی زۆر گـران وقـورس، کەسـیش هۆکاری نەزانی، ملم ئاوسا ونەستوور بوو، تام بەرز بۆوە، ئینجا پفکەی سپی لە زارم دەرکەوتن، نانیـان لی حـەرام کـردم، بـووە هـۆی بیتاقـەتی ولاوازی جەستەم، هەستام سەردانی زۆر پزیشکم کرد زۆر پـشکنینیان بـۆ کردم بەڵام سوودی نەبوو، پاشان بڕیاریان دا نەشتەرگەری بکرێم ونمونەیەك وەربگرن بۆ زانینی ئاوسانەکەی ملم، لەو کاتەش باری دەروونیم لەو پەری خراپی دابوو، وام هەست دەکرد کەوا مردن زۆر لێم نزیك بۆتـەوە، دەسـتم کرد بە لە خۆپێچانەوە لـە کاتێـك دا ڕاسـتیەکان بـۆم ئاشـکرا دەبـوون، هەمیشە من بیانوم دەهێنایەوە، گوایە هێشتان گچکەم هەرچەندە تەمەنم (٢٠) ساڵان بوو، دەمگووت هێشتان کات زۆر لە پێشمە، بەڵام بەراستی

نەخۆشیەکەم پەیامێکی خوایی بوو بۆم هات، بۆ ئەوەی هۆشیارم بکاتەوەو رامچلەکێنێ بەوەی مردن نزیکەو هەرکاتێك هات دێت، سەرکەوتوو ئەو کەسەیە خۆی بۆ ئامادە بکات، نەشتەرگەریەکەم بۆ کراو دەرکەوت  سوپاس بۆ خوا ئاوسانەکەم نەخۆشی پیس نەبوو، بەڵکو ئەنجامی ڤایرۆسێك بوو، ئەوجا چارەسەریم وەرگرت وبەرەبەرە ڤایرۆسەکە بەدەرمان دەستی بەکەمبوونەوە کرد، بەڵام دیار بوو ئەو وانەیە بەس بۆ ئەوەی لە خەو راپەڕم، ئینجا مانگی رەمەزانی پیرۆز هاتە پێشەوە، شەوێك کە قەت لە بیرم ناچێ، لەلایەن پوورێکم داوەت کرا بووم بۆ رۆژوو شکاندن، پاش نان خواردنی ئێوارە پێشنیازم کرد لەگەڵ پوورم بچینە مزگەوت وتەراویح بکەین پێم گوت پێشتر نەمکردوە، گوتی با بچین هەموو شت سەرەتای هەیە.

ئەوجا بەراستی چووم وهەستم بە زۆر شتی خۆش دەکرد، پێشتر هەستم پێی نەکرد بوو لەو حەسانەوە وبەختەوەریە، ئەوجا پوورم گوتی: سبەی دێیتەوە؟

بەپەلە وەڵامم داوەو گوتم: بەڵێ رازیم، رێکەوتی (٢٧) ی رەمەزان بوو چووینە مزگەوتێك پێش نوێژ جوزئێکی تەواوی لە قورئان دەخوێند، بەراستی پڕی خەڵك بوو بەڕادەیەك من لەسەر پایەی قادرمەکان نوێژم کرد وپاش تەواو بوون مامۆستاکە دەستی بە نزاو پارانەوە کرد وخەڵکەکەش دەستیان بە پاڕانەوە کرد، منیش هەرچەندە هەستم بە گریان دەکرد بەڵام

گریانم نەددەهات، لێرەوە هەستم کرد هەڵەیەك هەیە بۆ هەموو دەگرین ومنیش پەککەوتە بووم لەڕژانی فرمێسك، هەستم کرد کەوا بەراستی زۆر لە خوا دوورم ئەوسا دەستم بە پاڕانەوە وگەڕانەوە بۆ لای خوا کرد کە لێم ڕازی بێ ولیم خۆش بێ وهیدایەتم بدات، هەر لەو شەوە هەستم بە لە دایك بوونێکی تازە کردوو لەوێوە تا ئێستا سوپاس بۆ خوا نوێژم نەچووەو سوورم لەسەر سوننەتەکان وشەونوێژ وچێشتە نوێژ... هتد

ئێستا هەوڵدەدەم فێری تەجویدی قورئان (خوێندنی بە ڕەوانی) بم بۆ ئەوەی لەبەری بکەم.

ئامۆژیگاریشم بۆتان ئەی خوشك وبرایان ئەوەیە، هیچ ئامۆژگارییەك ڕەتنەکەنەوە بۆ خوا پەرستی، باوەڕم پێبکەن ئەو بانگەوازە وەکو سەرەداوێك وایە ئەگەر ئێوەش دەستتان پێوە گرت، ئەوەئاسوودەیی وبەختەوەری داتان دەپۆشی ولەخوا داواکارم کە منیش ویڕای ئێوە دامەزرا وبکات لەسەر راستە شەقامی هیدایەت.

# ﴿ بەخششی خوا ﴾

بەسەر هاتی هیدایەتی من لە ماوەی مانگێك کورتدەکرێتەوە، بەڵام لە سەختترین مانگەکان بوو کە بەسەرم دا تێپەری ئەگەر فەزڵی خوای گەورە نەبا نەدەگەیشتمە ئەوەی ئێستا لەسەرم، سکم هەبوو لە مانگی هەشتەمی پاش چەندین ساڵی درێژ لەگەڵ بەکار هێنانی چارەسەری، خوا ویستی وابوو باری تەندروستیم بەرەو خراپیەکی ئاشکرا بچیٚ، پزیشکە گەورەکان دەستەوەستان بوون لە چارەسەری خۆم ومەلۆتکەکەم بەراستی هیچ تواناو ئومیدێك نەمابوو بۆ رزگاربوونی هەردووکمان، بەڵکو ئاشکرا بوو ئەو سکەی من چاوەرێم دەکرد، لە کاتیکدا نە نوێژم دەکردو ئەشوکرانەم دەکرد ئەوجا پاش ماندووبونێکی چارەسەری پێی بەخشی بووم، باری تەندروستی کۆرپەکەم بەرەو لاوازی چوو بە شێوەیەکی ئاشکرا ئەویش لە گەشە کردنی سروشتی وەستا بوو، لەبەر چەند هۆکارێك کە بەدەستی مرۆڤ نەبوو، لیرەدا خۆم دواند ودڵنیا بووم لەسەر ئەوەی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، کەسیش لەم بوونەوەرە ناتوانی سوودیان زیانت پیٚ بگەیەنیٚ تەنیا ئەوەی کە خوا نوسیبیٚ ئای چەند بیٚ دەسەلاٚت بووم کە هیچ توانایەکم بە دەست نەبوو پزیشکەکانیش نەیان توانی هیچ جۆرە یارمەتیەکم بدەن.

ئەی مرۆڤ تۆ چەند بیٚ دەسەلاٚتی!! تۆ چەند پێویستیت بە خاوەنێکی

گەورەیە!! لەو پەڕی لاوازی دای لە کاتی تەنگژەکاندا.
بەڵام دنیای فانی دەستخەڕۆمان دەکات، دەمدیت خەونەکانی پێشم ڕۆژ بەرۆژ بە فیڕۆ دەچوون، بەڵام گەرامەوە لای ئەو خوایە نەمرە، کە هەمیشە پشتی پێ دەبەستین لە کاتی تەنگانەدا، ئەویش چەند بە میهر بوو بۆمن.... چەند بەرامبەرم بەخشندە بوو، بەخوا خوشك وبرایان باری دەروونی من لەو کاتە دا بێننە پێش چاوتان بەڵام لەگەل زیکر وقورئان ونوێژ ونزا و یەقینداری بەوەی، کەخوا وەڵامم بداتەوە، هەرچەند من شایەنی ئەوە نەبووم چونکە لە کاتی شێنەیی و لەش ساغی یادم نەکرد بوو..

بەڵام یادم کردەوە لە کاتێك دا بێ دەسەڵات بووم, کەواتە پێش بینی دەکەن لەو خوایە بەخشندە و لێبوردە و رۆزی دەرە و شیفادەرە خاوەنی شکۆبەخششەکان، پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی، لەبەر ئەوەی بەخشندەیە ئاسوودەی وحەسانەوەی بەسەر دا باراندم، هەرچەندە ئەو ڕووداوەی کەمن تێدا دەژیام، موژدەی چاکەی پێوە دیار بوو، لێرەدا هەڵوێستەیەکم هەیە، توخوا پەندی لێوەر بگرن، ئەویش ڕاستیەکەی خوای توانا دار بتگاتێ، هەرچۆن بێ ئەی بەندە تۆ بۆ پەرستش و زیکری ئەوی، کەواتە هەمیشە یادی بکە خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێك هەیە، ئێمەی بۆ ئەوە خولقاندوە کە بیپەرستین وسوپاسی بکەین، لەسەر ئەو هەموو بەخششە زۆرەی کە پێمانی بەخشیوە، ئەگەر ئەو بەخششانە نەبا

ئەوە بەکەڵك ئەو ژیانە نەدەهاتین، دەکەوایە بەندایەتی بکەو کرنۆشی بۆ بەرە وبزانە بێجگە لە خوا کەس ژیانت ئاسوودە ناکات، بە سامانیش سامان ودنیا بەسەر دەچێ، دەکەوایە دەستمایەیەك کۆبکەوە کە قەت کۆتایی نایێ، هەروەها توێشوێك کۆبکەوە بۆ سەفەرێکی درێژ ومالی هەمیشەو مالی بێ کۆتاییە، بە کورتی خوا ویستی کە کۆرپەکەم لە هەشت مانگی دا ببێ وچاوم پێی گەش بۆوە وبە ویستی خوا رزگاری بوو لە مەرگێکی مسۆگەر، چەند رۆژێك لە نەخۆشخانە خەوێندرا هەتا باری تەندروستی جێگیر بوو، بەهەر (حاڵ سوپاس بۆ خوا وناوم نا (مەریەم) چونکە سورەتی مەریەمم زۆر دەخوێندەوە، ئەو کاتەی کە لەسکم دابوو، زۆر لە خوا دەپارامەوە رزگاری بکات و چاوم پێی رۆشن ببێتەوە، چەند لە خوا پارامەوە سەلامەتی بکات بریارمدا ناوی بنێم مەریەم، بەناوی ئەو سورەتە پیرۆزەی ئێستا دەیخوێنمەوە بەکوڵ دەگریم وبە یادم دێتەوە کە خوا هەتا ئەو پەری بەخشندەیەو هیچ پەناگەیەك نیە تەنیا پەناگەی خۆی نەبێ، ئینجا هیدایەتی دام وزانیم کەخوا بالا دەستەو بە تەنیا لە تەنگانە پشتی پێ دەپەسترێ و دووریمان لەخوا پێ ناکرێ، لە خوا دەپارێمەوە لێم خۆش بێ و رەحمم پێ بکا ورێگا ودڵم رۆشن کاتەوە بە رۆشنایی ئیمان وگویرایەڵی میهرەبان، هەر خۆی چاکترین خاوەن وچاکترین پشتیوانە، سوپاسی خوا دەکەم لەسەر ئەوەی کە چاوم بە دیتنی ماڵەکەی خۆی رۆشن کردمەوە ونوێژی پێبەخشیم لە پیرۆزترین خاکی سەر زەمین ئەویش لە عومرە بوو.

# ﴿ کچەکەی خۆم بەفیڕۆدا ﴾

چیرۆکەکەم بەسەر هاتی باوکێکە کە فرمێسکی داخ وپەشیمانیٚ دەڕێژێت، پاش ئەو خەونەی کە بەکچەکەیەوە بینی کە پیش ماوەیەك بەنەخۆشیەکی پڕ ئازار کۆچی دوایی کرد بوو، گوتی: دیتم کچەکەم تەماشای دەکـردم و دەیگوت: (حسبي الله ونعم الوكيل) چەندان جار دووبارەی دەکردەوە، گڕم تێبەر بوو بە پەرۆشەوە گوتم: ئەوە لەگەڵ کێتە هەتا تۆڵەی لیٚ بکەمـەوە. گوتی: لە تۆ بابە ئەی ئەوەی کە بەفیڕۆت دام، بەبیٚ باکی، ئەی ئەوەی کە ناپاکیت لەگەل راسپاردەکرد، ئەی ئەو کەسەی بویە هۆی ئەوەی کەوا من ئێستا لەسەرم، خوا حەقم لێت بکاتەوە.

بەمەش توشی راچڵەکین بووم، ئەوجا پرسیم تۆ ئێستا لەکێندەریٚ ی؟

وەڵامی دامەوە بۆچـی نـازانی لـە کـوێم؟ لـەو کاتـەدا رووخـسارە نـەرم نۆڵەکەی گۆڕا بەرەو رووخسارێکی ترسناکی قێزەون، چاوەکانی وەکـو دوو پشکۆی ئاگریان لیٚ هات، گوتی: لە چاڵێك لە چاڵەکانی ئاگری دۆزخ دام.

گوتم: لەبەر چی؟ چ شتێك وای لەتۆ کرد؟

گوتی: تۆ خۆت هۆکاری، خۆت ئاگادار بووی کە سەیری فیلم پڕو پووچمان دەکرد هەتا نیوە شەو، قەدەغەت نەدەکردین، کاتی نوێژی بەیانی لە خەو بانگت نەدەکردین، بەڵکو لەگەڵمان دەهاتیە جێگای فرۆشتنی وبەکرێـدانی

فیلمەکان، ئەوەی فیلم فرۆشەکە دەیگوت مرۆڤ مچورکی پێدادی لەشەرمان، ئەوجا بایەخمان نەدەدایێ بەڵکو پێدەکەنین، دەچووینە بازاری ڕووت و سفوورەکان بە بۆنی خۆش و لارو لەنجە بەبێ مەحرەم بۆ لادانی گەنجان بەبێ ئەوەی بایەخ بدەی‌و چاودێریمان بکەی، ... تۆش شتێك نەبووی...

ئەوجا خەونەکە پچڕاو پە شپرزەیی بەخەبەر هاتم، باوەڕم پێبکەن... هەرچەندە لەسەر چارەنووسی کچەکەم زۆر داخدارم بەڵام خۆزگەم دەخواست لە خەونەکەم رانەپەڕیبام هەتا قسەکانی تەواو دەکرد، چونکە دەمویست ئەو هەموو هەڵانە ڕاستبکەمەوە کە لە پەروەردەکردنمدا ڕەچاوم نەکرد بوو، لەپەروەردە کردنی کچەکانی ترم، بۆ ئەوەی لەمەو دوا بەپەروەردەیەکی ئیسلامی تەواو گۆشیان بکەم

ئیستا داواکارم لەهەموو ئەو کەسانەی کە کارەساتەکەم دەخوێننەوە دەستیان بەرەو ئاسمان بەرزبکەنەوە لەگەل من، خوای گەورە لەکچکەم خۆش بێ، دوای پەروەردگار، ئەو بووە هۆکاری گەڕانەوەی من و هیدایەت دانم.

# « بەرەبەیان »

ئا لەو کاتەی بەرە بەیان دەدرەوشایەوە، دەنگی کچە ساواکەم هات ولەخەو هەستام شیر وخواردنەوەم بە هێمنی دایێ ونوستەوە. هێشتا نوێژی بەیانیم نەکرد بوو، لەنوێژ بێ ئاگابووم وکەوتمەوە خەو ولەخەونم دا دیتم بە تەنیا بەدوای کچەکەم دەگەڕام لەکوێ یە؟ بەدوای دادەگەرام نەمدیتەوە لەخەو هوشیار بوومەوە، لەتەنیشتم بوو دوو سەعاتی نەبرد تای بەرز بۆوە...!! ئای ئەوە چی یە؟بەبێ هۆکار وبەبێ پێشەکی چی بەسەر هات؟ ئەوە بۆ؟ نەخۆش کەوت ورەنگی ڕوومەتی پەمبەیی زەرد هەلگەڕا، زەردێکی کوشندە دکتۆر گوتی: باشە بەلاّم دەبێت هەندێك پشکنینی بۆ بکەم، هەموو پشکنینەکان سەلماندیان نەخۆشە، بەلاّم نەخۆشیەکی گران نەبوو، ئەوجا لە خوا پاڕامەوە کە شیفای بدات، بەلاّم بە چ ڕوویێك داوا لە خوا بکەم، چۆن داوای سەلامەتی لێ بکەم، چونکە من خۆم هۆکار بووم ولەنوێژی بەیانی بێ ئاگا بووم ودەمچواند، بەلّی بەبیرم دێ پێش بوونی ئەو هیچ نوێژێکی بەیانیم نەدەچواند، بەراستی ئەو هۆکارەبوو، نەخێر ئەوە نیە بەلّکو من شەوخونیم دەکرد تا کاتێکی درەنگی شەو بۆ ئەوەی دوا ژەمی بدەمێ وئەوجا بنووم ئابەو جۆرە نوێژی بەیانیم دەچوو، نوێژ چوواندنەکەم پەیوەست کرد بە نەخۆشی کچەکەم،

رەنگە خوا حەزی کرد بێ سزام بدات لەسەر نوێژی بەیانی چواندن، هەوڵمدا کاتەکەم رێکبخەم بۆ ئەوەی بۆ نوێژی بەیانی هەستم، ئەوجا بەیانی یەکەم و دووەم بەئاگا هاتم ودوو رۆژیش پاش کەوتم پاشان لە سەر نوێژی بەیانی بەردەوام بووم و چوومە لای پزیشك و هەموو پشکنینەکەشم لەگەڵ خۆم برد، پزیشکەکە پێی گوتم: کچەکەت باشەو سەلامەتە وەکو ئەوەی کە پشکنینەکانی پێش وهەموویان هەڵە بن. ئەوجا تۆبەم کرد وگەڕامەوە لای خواو دەستم بە نزا کرد، پاشان لە هیچ نوێژێکم بێ ئاگا نەبووم ونەمچوواندوە.

# ﴿ ئەو مردنە چەند جوانە ﴾

گەنجێك وەکو هەر گەنجەکانی گوندێك لە کوردستان لە دایك بوو، ئەوجا باوکی سەفەری کرد بۆ دیمەشق لەگەڵ خۆی بردی وگەورەو پەروەردە بوو لە دیمەشق و بووە قوتابی لە ژێر دەستی کۆمەڵێك مامۆستای ئەویَ، هەتا زانستە شەرعیەکانی تەواو کردو بووە بیست ساڵ و تووشی لووت بەرزیو شانازی بەخۆ کردن هات ووای لێهات شانازی بەسەر ناسراوەکانی دەکرد بە زانستەکەی هەتا خوا ویستی هیدایەتی بدات.

جارێك کەسێکی سادە هاتە لای و نامۆژگاری کرد، بچێتە کۆڕی زیکری پاك بوونەوەی یەکێك لە زانا گەورەکان لە چیای (قاسیون)، لەسەرەتا رەتی کردەوە بەڵام زۆری نەبرد خوای گەورە دڵی نەرم کردو چووە کۆڕەکەو زۆر کاری لیَ کردو وای لێهات بەردەوام لەویَ نامادە دەبوو، ئەوجا گۆڕا بە گۆڕانێکی بنەرەتی. خێزانەکەی دەڵیّ: (شیخ ئەمین ئەگەر خواردنێکم بۆ دابنابا کەمێك سوێربا یان بیّ خویّ با ئەوە دنیا لەسەری وێك دەهات، پاش ئەوەی مولتەزیم بوو ئەگەر خواردنێکی سوێرم بۆ دابنابا پێدەکەنی) و دەیگوت: (کەمێك خوێم بۆ بێنە، دڵم مەشکێنە)

ئەو مامۆستایە دەستی کرد بە پەروەردەو دەرس وتنەوە، خوای گەورە خەڵکێکی زۆری بە سوودی ئەو بەهرەمەند کرد.

لەرۆژەکانی کۆتایی نەخۆشیەکەی، هەرچەندە جوڵە کردن زۆر بۆی سەخت بوو، بەڵام بەرەنگاری دەبۆوە وهەڵدەستا بۆ ئەوەی ئامۆژگاری خەڵك بکات، دڵنیا بوو کە خوا رەنجی بەفیڕۆنادات، بە راستیش خوا نزیکە لە گومانی چاکی بەندەی خۆی، کاتێك مەرگ لە شێخ ئەمین مێوان بوو تەمەنی (٦٣) ساڵ بوو، قوتابییەکانی دەوریان دابوو لەگەل کورەکەی شێخ ئەحمەد هەستی بەمەرگی کرد، ئەو هەواڵەی بەخەڵکەکە راگەیاند، ئەوانیش ویستیان کە شەهادە بە گوێی دا بچرپێنن وبیری بخەنەوە ئەویش رووی تێکردن وپێی گوتن: ئێوە بڵێن(لا الـه الا الله)، لە جیاتی ئەوان پێی بڵێن، ئەوجا دەنگی بەرەبەرە کز بۆوە وچاوی مۆڵەق بوو هەر دەیگوت: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ٢٧ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ٢٨ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ٣٠﴾ (الفجر)

واتە: ((ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی (ئەی ئادەمیزادی ژیر و هۆشمەند کە لە تەمەنی کۆتایی دنیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانی دەتپەرست).

(بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەدگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ رازیە. دەبچۆرە ریزی بەندە چاکە نازدارو بەرێزەکانمانەوە، بچۆرە بەهەشتە خۆشە رازاوەکەمەوە)) (ت: ئاسان).

ئەوجا سەرنجی دا دەور وبەری خۆی وهەتا دەنگی تێدا بوو گوتی: (**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**) ماڵتان ئاوا، گیانی پاكی سپارد لە شەوێك دا كە شەوی قەدر بوو، كە خێری زیاترە لە هەزار مانگ، گیانی پاكی داو بەرەو پەروەردگاری گەڕایەوە. تـوخـوا ئەو مردنە چەند جـوانە.!

# ﴿ خوا لە هەموو شتێك شایستە ترە ﴾

لە ساڵی ڕابردوو لە قوتابخانەیەکی بیانی دەرچووم، کە تێیدا فێری هەموو شتێك بووم، کەوا ڕێپێدراو و ئاسایی بوو، ئەگەر بهاتبایە من لە خێزانێکی موسڵمان نەبام، نازانم ئێستا حاڵم لە کوێ بوو، ئارەزووی وەرزشم هەبوو تەمایەکی گەورەم بۆ دوا ڕۆژم پێ بوو، هەروەها دەستە خوشکێکم هەبوو، هەمان ئارەزوو وئامانجی هەبوو، ئەویش قارەمانێکی وەرزشی عەرەبی وئەفریقی بوو، ڕۆژێك هاوڕێیەکی دیندارخوا پاداشتی بداتەوە پێ ی گوت: ئەرێ ئێستا وەختی ئەوە نەهاتووە واز لە وەرزش بهێنیت باڵا پۆش بیت؟ ئەویش گوتی: هەتا ئێستا ئاواتی زۆرم هەیەو هێشتا نەهاتۆتە دی! ئەویش بەزیرەکی، کە کچەکە هەستی پێ نەدەکردپێی گوت: ئایا ئەگەر کەسێکی بەڕێز هاتە داخوازیت بەومەرجەی واز لەوەرزش بهێنی وباڵا پۆش بی ئایا ڕازی دەبیت؟
بەخێرای وەڵامی دایەوە(بەڵێ،ئەگەر شایستە بێ)
پێی ڕازی دەبم، ئایا خوای گەورە شایستە نیە؟
هەڵبەتە نەیتوانی وەڵامی بداتەوە، بەڵام سەیرە کەئەو قسەیە کاری تێنەکرد، بەڵکو سوپاس بۆ خوا کاریگەرییەکی قوڵی لەناخی من بەجێهێشت، هەتا چوومە ماڵ وخۆم بەباڵاپۆشی تاقی کردەوە، هەرچەندە

ڕام لەخۆم نەبوو جل وبەرگی گونجاوم نەبوو، بەڵام ڕۆژی پاشتر خۆم دیتەوە کەوا بەو بەرگە هەنگاودەنێم بۆ نوێژی هەینی وسووربووم لەسەر ئەوەی کەهەرچەندە ڕەخنەم ڕووبەڕوو بکرێتەوە، بەڵام ڕازی نەبم چرکەیەکیش واز لەهیدایەت بێنم کەخوای گەورە پێی بەخشیم.

ڕەنگە ئەو گەنجەی هەتا ئێستا بەم شتەی من نەزانێ، بەڵام هۆکارێکی ڕاستەوخۆ بوو لەهیدایەت دانی من .

ئێستاش من وازم لەوەرزش هێناوە، کە زۆریش خۆشم دەویست، خوا ڕاستی فەرمووە لەپەیمانەکەی کەمنی گۆڕی بەبڕوادارێك کە لە دڵمەوە تامی شیرینی ئیمان دەچێژم.

## ﴿ کتێبێك بووە هۆی هیدایەت دانم ﴾

بەبێ باس کردنی درێژە دادڕی لەسەر خۆم، لەبەر چەند هۆکارێك کە خوا خۆی دەیزانێ، بەڵام ئەگەر هەر یەکێکتان بیەوەێ مانای ژیانی خۆی بزانیت و دەرك بە راستی شتەکان بکات، ئەوە راستیەکان زۆرن لەناخی دەروونیدا، هەروەها کەسانێکی زۆریش دەناسی، کە فریشتە نین بەڵکو ئەوانیش مرۆڤن، بەڵام ئەوان هۆکاری بەدی هاتنی خۆیان زانیوە وێڕای کۆتایی ژیانیان و ڕێگای گەیشتن بەو کۆتایەی کە تەنیا رازی دەبن پێی بۆخۆیان، جا هاورێ ئەگەر زانینی ئەو هەموو شتانەت دەوێ لەسەرت پێویستە، کتیبی(رجال حول الرسول) ﷺ پیاوانی دەورو بەری پێغەمبەرﷺ لە نوسینی (خالید محمد خالید) بخوینیتەوە، منیش لەوەتی ئەو کتیبەم خوێندۆتەوە، راستەوخۆ ژیانم گۆڕاوە، سوپاس بۆ خوا شەرمم لە خۆم کردەوە بەرامبەر ئەو خەڵکەی لەدەور وبەری پێغەمبەر بوون.

دکتۆرەکە دەرزی بەکارهێنا هەوڵی لەگەڵم دا هەستامەوە، بەڵام نیمچە بێ هۆش بووم، هەستم کرد کەمردن مسۆگەرە، تەنیا لەسەر کات ماوە، پاش ئەوە نەمزانی چی ڕوویدا بەڵام ماوەی چارەگە سەعاتێك نووستم وشیار بوومەوە بەحاڵەتێکی نیمچە باش، ئینجا زنجیرەیەك لەچارەسەری دەستی پێکرد بەشوێنی دا گەشتێکی ئاسایی لەگەڵ دنیا دەستی پێکرد، بەڵام (هەرچەندە ئەو هەڵوێستەم لەبیرکردبا) وەبیر خۆم دەهێناوە بۆ ئەوەی بزانم خوا چەندە بەخشندەیە... چەند لەمردن نزیکم... وێرای ڕێزم بۆ ئەو هەموو شیکردنەوانەی کە دکتۆرەکان پێشکەشیان کرد، بەڵام من دڵنیا بووم لەوەی کەوا ئەو هەڵوێستە ئاگادارکردنەوەیەك بوو لەخواوە بۆمن، بۆ ئەوەی لەگوناح دوور بکەومەوە، لەکۆتایی بگەڕێمەوە بۆ لا ی خۆی، داواتان لێدەکەم توخوا دیقەت لەبەسەرهاتەکەم بدەن وماناکانی تێبگەن، هەموو شتێك ئەنجامی هەر ئەمانە تەنیا کردەوەی چاکە ئەبێت.

## ﴿ مادده هۆش بەرەكان (تریاك) ﴾

ئەوە بەسەر هاتێكی راستەقینەیە لە رۆژگارێكی پڕ ئـازار، ئـەو كەسـەی بۆمان دەگێڕێتەوە خۆی بەسەری هاتووە:-

فرمێسك بەتەنیا بەش ناكات وهەزارجار مردن ناكاتە تاكـە ئاخێـك، كـە لەناخی بریندار ودڵی كەلاوەم دەردەچێت، ئیـستا دەزانم بەختـەوەر ئـەو كەسەیە پەند لە غەیری خۆی وەرگرێ، و رەنجە رۆش ئەو كەسـەیە خـۆی بكاتە پەند، ئافەرین بۆ ئەو كەسەی ئەو پەندەی گوتوە، ئافەرینی خـواش بۆ ئەو كەسەش كاری پـێ بكـات، بەسـەر هاتەكـەم بەراسـتی پـڕ داخ و كەسەرە لەهەرچركەیەكی ژیاندا، هەرچەند رۆژێكی نوێ دەسـتی پێكردبـا ئەندێـشەكانم تازەدەبنـەوە، لەهـەموو چـركەیەك بـەڵكو لەهـەموو چـاو تورکانێك هەموو شتێك لە دڵـم دەسـوتێ، هـەموو رۆژێـك هـەزار جـار دەمرم بەڵكو هەزاران جار، كەسیش نازانی چیمەو تەنیا خـوا نـەبێ، مـن بووم كە كاوڵم كرد ووێرانم كرد ئەو شتەی كەوا سامان بوو، بە دەستی خۆم دوو دەستی تاوانباری چەپەڵی ئەفرین، هەموو شتێكم وێران كرد.

ئەی خوایە چ بیركردنەوەیەكە، ئـەی خوایـە ئەندێـشەیەكی چـەند گرانـە، لەهەموو بەیانیەك ئازارەكە دووبارە دەبێتەوە، لە هـەموو گۆشـەیەك لـە گۆشەكانی ماڵ، خەمەكان تازە دەبنەوە، جۆرەها سزا دەبینم بەچـاوم، لـە

ناخمــەوە هــاوار دەکــەم، ئەگــەر دەری بکــەم دیوارەکــانی بەرامبــەرم وەدەروخێنــیێ، لــەو کاتــەی کــە شــەو دادێ ورۆژ دادەپۆشــێ، ئەوشــەوەی شەیدایان بۆی پەرۆشن وگۆرانی بێژان گۆرانی بۆ دەڵێن، شەوخونی کــاران ناخی بۆ هەڵدەکێــشن لــەو کاتــە دا هــەزار جــار دەگــریم وداخ وکەســەر هەڵدەکێشم، چونکە زیندووم وهەتا ئێستا دەژیم.

دەمەوێ بمرم بەڵام نامرم، رەنگە لەبەر ئەوەی ترسنۆك بم، یــانیش رەنگــە لەبەر ئەوە بێ، هەتا تاوانەکەم دووبارە نەکەمەوە، یان بۆ ئەوەی خوا لێم خۆش بێت، لەسەر ئەوەی کەوا لە رابردوو ئەنجامم داوە، واتە ژەقنە بووتی رابردوو، زۆر کەس هەن چێژ لە رابووردویان وەردەگرن، حەزدەکــەن یــادی بکەنەوە تەنیا من نەبێ دەزانن بۆچی...؟ نامــەوێ پێتــان بڵــێم چــونکە دەترسم نەفرەتم لێ بکەن دوعام لێ بکەن، زیاتر لە دوعــای خۆم وئــەفرەتی خۆم، رەنگە لە ئێوە مرۆڤێکی چاك هەبێ نزای گیرا بێ وخواش بــە نــزای ئەو سزام بدات ونەفرەتم لێ بکات ببوورن لەسەر وتــە پــوچ وناڕێکــەکانم، لەبەر ئەوەی من گرفتارم، واتە لێقەمام خۆزگە هەر لیقەومان بــا بــەڵکو هەردووکیانم بەڵکو سێ وبــەڵکو زیاترێــشە، مــن بــووم هــەموو شــتێکم فرۆشــت وهیچیــشم بەدەســت نەکــەوت، بــەخوا بەســەرهاتەکەم کــەبۆتان دەگێرمەوە بۆ هیچ نیە، بەڵکو تــەنیا ئاگاداریتــان دەکەمــەوە، وریــا بــن لەوەێ تێبکەون وەکو ئەوی کە من تێکەوتم، بەخوا خامــە شــەرم دەکــات لەوەی دەمەوێ پێی بنوسم، پەنجەکانم هەزار جاربەرم لێ دەگرن ودەیانەوێ

قەدەغەم بکەن، لە نوسینەوەی بەسەر هاتەکەم، بەڵام دەینوسمەوە، بەڵکو خوای گەورە چاکەیەکم بۆ بنوسێی، بەڵکو لەرۆژی قیامەت پێی بگەمە دیداری خوا بەپەشیمانیەوە.
گازاندەم لی مەکەن گۆی بگرن لەبەسەر هاتەکەم وحوکمی لەسەر بدەن وئامۆژگاری وپەندی لێوەربگرن پێش ئەوی کاتتان بەفیڕۆ بڕوات:
من گەنجێکی سادەی خۆش گوزەران بووم لە خێزانێك، کە خواناسی وپۆشتەی ورۆزی پڕ فەری بۆ نوسیبووین، هەر لەوەتی چاومان هەڵێنا بوو لە بەختەوەری دەژیاین بە ئاسوودەیی و خۆشەویستی لەخیزانێك، کە پێك هاتبووین لەدایك و باوك وداپیرو شەش برا کەمن حەفتەمینیان ولە هەمووان گەورە ترو خوشکێکی لەخۆم گەورەتر، من کوڕی گەورەو سەرپەرشتیاری ماڵ بووم، پاش باوکم هەمو چاویان لەمن بوو، لەناوەندی دەخوێند وخوشکیشم لە سێیەمی ناوەندی بوو، ئەوانیکەش لەبراکانم لە پاش ئێمەوە لە خوێندن بوون، من خۆزگەم دەخواست کە ببمە ئەندیازیار بەڵام دایکم رازی نەبوو دەیگوت: فڕۆکەوان، باوکم لای من بوو، دەیگوت: گرنگ لە زانکۆ دەرچی هەر کام پسپۆری بێ، خوشکەکەم دەیویست ببێتە مامۆستا بۆ ئەوەی ئەوەکان پەروەردە بکات بە ئایین وئاکاری جوان، بەڵام هەیهۆ بۆ خەونەکان، وای بۆ ئامانجەکان، چەندان کەس سەریان نایەوە پێش ئەوەی خەونەکانیان بێتەدی، وەچەندان کەسیش دەستە وەستان بوون لە بەدی هێنانی خەونەکانیان، وچەندان کەسیش خەونەکانیان هاتە دی،

# ﴿ سەرپێچی کار ﴾

هەر لەوەتی چاوم بەدنیا هەڵهێناوە، دەمدیت باوکم گیرۆدەی ئارەزووەکانی بووە، لەڕابواردن ودەرچوون وئارەقی لەگەڵ هاوڕێکانی دا دەخواردەوە، وێڕای ئەوەش هەرگیز ڕەزیلی لەگەڵمان نەدەکرد، هەرچمان داوا بکردبا، تەنیا مەرجی ئەوە بوو باڵا پۆشی نەکەین وهەردەم گاڵتەی بەو کچانە دەهات، کەباڵاپۆش بوون، هەر سوور بوو لەسەرئەوەی کەبەسەلیقەی ئەو بکەین ئەگەر لەگەڵ دابونەریتی ڕۆژهەڵاتیمان بگونجابا، یان ئازادی تەواوی دابووین (بەتایبەتی لەگەڕان وشەونخوونی)و پەیوەندی نێوان کوڕو کچانی بەشارستانیەت دادەنا، لەبەر ئەوە لەگەڵ گەنجە هاوڕێکانی براکانمان دادەنیشتین، بەڵام دایکم لەولاوە پێی خۆش نەبوو، بەدڵی نەبوو هەندێك جار بێدەنگ دەبوو، هەندێك جاریش چاو پۆشی دەکرد، باوکیشم لەگەڵ هاوڕێکانی زۆر سەفەری دەکرد (بۆ بەدکاری)، دایکیشم چاك دەیزانی هەر دەیگوت، مادام بەدڕەوشتی لەدووریماڵەوە دەکات قەیدی نیە! جارێك باوکم سەفەری کرد سەفەرەکەی درێژبوو پتر لەمانگێك.. پاشان هاوڕێکەی باوکم پەیوەندی پێوە کردین بۆ ئەوەی هەواڵمان بدات کەباوکم سبەی دەگاتەوە ولات... بەڵام چیمان دیت مردوو!... پاش زانینی هەواڵەکە باوەڕمان نەکرد، چونکە تەندروستی ساغ بوو، ڕۆژێك ئازارێکی نەبوو، زۆر بۆی گریاین، بەتایبەتی من کە کچە گچکە بەنازەکەی بووم و هیچ بێ دڵی نەدەکردم... ئینجا تەرمی

باوکم،گەیشتەوە، زۆر بۆی نیگەران بووم وبەکوڵ بۆی دەگریام، هەرکە ڕۆژانی پرسە تەواو بوو، چوومە لای هاوڕێیەکەی کەلەگەڵی دا لەسەفەرەکە دابوو، گوتیان کەوا لەناو مزگەوتەو بەدەگمەن دێتە دەرێ، بەڕاستی زۆر سەرسام بووم لەو وەرچەرخانە ناکاوەی کەبەسەری هاتبوو، پاش ئەوەی زۆر موکوڕ بووم، ڕووخساری زەرد هەڵگەرا بوو پێم گوت: مامە دەمەوێ بزانم باوکم چۆن مرد؟

هەنسکی گریانی داو سوێندم بەخوا خوارد، باوەڕناکەم بۆئەوەی کە بەدایکمت گوت بوو گوایە (کارەساتی ئۆتۆمۆبیل بێت) پاش تکایەکی زۆر کارەساتەکەی درکاند و گوتی: لەو کاتەی کەشەوچەرەمان دەکردو ئارەقمان دەخواردەوە، کچمان لەگەڵدابوون بەباوکتم گوت: ئەو کچەی لەگەڵ منە لەوەی لەگەڵ تۆدایە جوانترە کەوا دێت لەگەڵت دابنیشێت... باوکت گوتی: تۆ هێشتا نەتدیتیە! ئێستا دێتە ژووری، کەهاتە ژوورەوە بە هەموو جوانی ونازدارییەوە... بابت هەستاوەو سوجدەی بۆبرد لەبەر جوانیەکەی... بانگم کرد بەڵام هەستی نەمابوو... دووبارە بانگم کردەوە وەڵامی نەبوو، جوڵاندمەوە دیتم مردبوو، بەڕاستی مردبوو لەوکاتەی کەلەسوجدە دابوو بۆ کچەکە!... پاش بیستنی ئەم هەواڵە بۆئەو مردنە ناشرینە وبەدبەختیە زۆر گریام، پاشان... هەستام دەستنوێژم شوشت و نوێژم کرد، داوای لێخۆشبونم بۆباوکم لەخوای گەورە کرد، باڵام پۆشی لەخوا پاڕامەوە کەکۆتا خێرم بکات... ئێوەش هەموو بڵێن : ئامین.

# ﴿ مردنم دیت ﴾

لەژیانی مرۆڤدا چەندان هەڵوێست بەسەری دا تێدەپەرێ، بەشێوەیەکی چاك کاری تێدەکات (ئەگەر کاریگەریەکە کاتیش بێت) وای لێدەکات بەرەو خوا بگەرێتەوە وهەست بەگەورەیی وبەزەیی وچاکەی بکات لەگەڵ بەندەکانی... لێرەدا بەسەرهاتی یەکێك لەو هەڵوێستانە دەگێڕمەوە بۆئەوەی فەزڵی خوا لەسەرتان بزانن.

لەرۆژێکی هاویندا لە کۆمپانیایەکی گەورەی دەرمان پرۆڤەم دەکرد، یەکەم رۆژم بوو لەپرۆڤەکەدا، کاتی نیوەڕۆ هەستم بەهەندێ ماندوو وشەکەتی کرد، بەڵام کۆڵم نەداووام زانی شەکەتیەکی ئاساییە، بەڵام لەکاتی بەرێکەوتنم دازیادی کردوو هەستم بەترسناکێ زۆر کرد، تاوام لێهات نەتوانم بڕۆم، جا پەیوەندیم بەبراکەمەوە کرد بۆ ئەوەی بێت وبمباتەوە، هەرچەندە ماڵمان لەو جێگایە نزیك بوو بەڵام بەلامەوە زۆری پێچوو نازانم ئایا گیر ببوو یان نا.. هەتا نەمتوانی بۆ چاوەڕێش ڕاوەستم، زۆر بەزەحمەتی تەکسیەکم ڕاگرت بۆماڵ، کەگەیشتمەوە ماڵ نقەم لێوە نەهات، چوومە هۆدەکەم و خۆم فرێدا سەر قەنەفەکە، هەستم بەهەستیارییەکی نامۆ دەکرد.. بەڕاستی مردنە! وام هەستکرد ڕوحم لەجەستەم ڕادەکێشرێ، هەستم کرد گیان لەدەست وپێم نەمابێ هەستێکی سەیربوو.. ئەوجا دەستم بەڕشانەوە کرد لەوەی خواردبووم.. زۆر بەزەحمەت

هەستام دەست نوێژ بشۆم ودوورکات نوێژ بکەم.. تۆی مردن چەند لێمان نزیکە هەرکاتێك بیەوێ دێت، ئایا کەهات تۆ لەسەر گوێڕایەڵی خوای، یان خوانەخواستە لەسەر تاوان، پاش نوێژەکەم هیچ گومانم نەماو ملکەچ بووم تەواو ڕازی بووم بەوەی کەدەمرم.. لەسەر زەوی بەرامبەر قیبلە ڕاکشام و وام هەست دەکرد ڕوحم دەکێشرێ بەرەو چۆکم هەڵدەکشێ، هەروەها لەدەستم هەتا گەیشتە گەرووم لێدانی دڵم وەستا هەروەها هەناسەم بڕا... تا لەو کاتەدا دایکم وبراکانم هاتنە ژووری بۆلام... ئەوجا دەستیان بە جوڵاندنم کرد بەتوندی بەناوی خۆم بانگیان دەکردم... بەڵام هەی هۆ هیچ وەڵام نەبوو... دایکم هاواری کردە براکەم دکتۆر بێنە... لەدڵی خۆمدا دەمگوت ئینجا دکتۆر چیدەکات؟... مەڕۆ بەرام مەڕۆ سوودی نیە... شریتی یادگاریەکانم بەمێشکم دادەهاتن، چەندان جار لەسەر گوێڕایەڵی وچەند جار لەسەر گومڕایی بوومە، لەدنیا چیم کردووە؟ ئایا دنیا ئامانجە یانڕێگا؟ هاوڕێکان لەکوێن؟ ئەرێ ئەو نەخشە ڕەنگا و ڕەنگەی کەدەتکێشا بۆ دوا ڕۆژت لە کوێن؟چی...چی...چی؟

پزیشکێك هات پاش پشکنین وتەماشا گوتی: مەترسێن... لەوکاتەدا هەستم کرد من بەڕاستی چوومەتە جیهانێکی دی، ئەو پیاوە هیچ دەسەڵاتێکی نیە... دکتۆرەکە سیپرتۆی بەکارهێنا بۆ بەخۆهاتنەوە... ئەوجا چەند چرکەیەك بەخۆ هاتمەوە... دیسان کەوتمەوەو هوڕێنەم بەچەند وشەیەك دەکرد وەك تەواو... لێم گەڕێن... دیسان بەهۆش خۆم هاتمەوە بەڵام دووبارە بەربوومەوە... جاری سێیەم بەهۆش خۆم نەهاتمەوە

گومڕایی وتاریکەیەکی تر، لەبەدی یەك بەرەو بەدیەکی تر، بەلاّم کەس وکارم پێیان نەدەزانی لە خویڕیاتیم هەتا وامان لیّ هات نەمدەتوانی لە دوو ڕۆژ زیاتر لە حەبەکە دوور کەومەوە، برادەرێك پێی گوتین نەك برادەر (بەڵکو دوژمن شەیتانێکی نەفرەت کرا) و گوتی: شتێکی باشتر وخۆشتر وکات درێژتر کە بەختەوەر ترمان دەکات ئەوجا بە دوای دا گەڕاین و بە پارەیەکی زۆر لەسەر حیسابی باوانمان کە نەماندەزانی ئەوان بەشدارن لە گومرایمان یان نا وە ئایا ئەوان، بارو تاوانی ئێمەیان لەسەرە یان نا؟

ڕۆژێك هاتمەوە ماڵ هەستم کرد خوشکم بە حاڵم دەزانیّ، بەجییّ هیشتم هەتا بخەوم، بەیانی هاتەوە هۆدەکەم وئامۆژگاری کردم و هەڕەشەی لیّ کرد م کەبۆی ئاشکرا بکەم، ئەگەر ڕاستی پیّ نەڵێم.

دایکم هاتە لامان وقسەکەمان بڕی، دایکم بۆ هەندی شتی ناردم، ئەو جا دەرپەریم ولەدەست خوشکم هەلاّتم، لە ترسی ئەوەی کە ساڵێك بوو یان زیاتر شاردبوومەوە لێیان.

جا یەك لە هاوڕێیەکانم دیتەوە پێکەوە چووینە ماڵی برادەرێکی دی ئەو شتە پیسەمان وەر گرت وباسەکەم بۆیان کرد ئەوەکو خەڵك بزانیّ ئابڕوومان بچیّ وبیریان لیّ کردەوە و یەکێك لە شەیتانەکان گوتی:- من چارەسەری دەزانم بەلاّم چ چارەسەریەك، بەخوا ئەگەر لە ئیبلیسش بپرسی ئەوەی بە خەیاڵ دا نەدەهات دەزانن چی گوت؟ دەزانن چۆن بیری کردەوە کە پێش بینی ناکەن!! ئەریّ خوشکم بکوژین؟ خۆزگە ئەوەی بگوتبایە...

بەڵام لەوە مەترسی دار تر بوو، ئایا گوتی زمانی ببڕین وچاوی دەربهێنین؟ نا بەڵکو لەوە مەترسیدار تر بوو، ئایا گوتی: بیسوتێنین؟ نا بەڵکو لەوە زیاتر بوو، دەزانن چی گوت؟ خوا پشتیوانەو باشترین بریکارە لە دژی ستەمکارانو بێ هۆشان وئەوانەی دەکرن ودەیفرۆشن خوا پەنامان بدات لە منی نەفرەت لێکراو، وە خوا کوێری بکات شێتی بکا وپشتی بشکێنی لە دنیا ودوایی سەری نەخات دەزانن چی گوت؟ ئەوەی گوتی: ستەم وسنوور شکاندن وبەکاری و دوژمنایەتی بوو، گوتی: باشترین چارەسەری ئەوەیە خوشکەکەت بێتە ڕێزی خۆمان وهۆشبەرەکەی دەرخوارد بدەین، بۆ ئەوەی قەت نەتوانی ئاشکرامان بکات، منیش بەرپەرچم داوە گوتم: خوشکیکی پاك وبە ئابڕووە ئەو دڵسۆزە، ئەوە خوشکمە خوشکم، بەڵام تیختیخیان دام و گوتیان: ئەو هیچ شتێك زەرەر ناکات، تۆ خۆت ببە ماڵێ وئەویش بەرێز وسەر بەرزەوە تەنیا چەند حەبێکە ئەوەندەکاری لێناکات.

لەژێر کاریگەری ومەستی، لەژێر پاڵە پەستۆی شەیتانەکانی وان وشەیتانەکانی خۆم، ڕازی بووم وهەموو شتێکم ڕێك خست چوومە ماڵ وخوشکەکەم هات وپێم گوت: چایەیەك لێبنی و ئەوجا من دان بە هەموو شتێك دادەنێم، ئەوجا خوشکە داماوەکەم چوو وهەموو ئاواتی ئەوە بوو چارەسەری گرفتی من بکات، منیش هەزار شەیتانم لەناو سەر بوو، هەر خەریکی ئەوە بووم، ژیانی هەموو وێران بکەم، ئەوسا چایەکەی حازر کرد

وپێم گوت: سەر وچایەمان بۆ تێبكە، ئەوجا پێم گوت: پەرداخێك ئاو بێنە وسویند بەخوا لەو كاتەی چووە دەرێ بێ ویستی خۆم دلۆپێك فرمێسكم هاتە خوارێ.

نازانم فرمێسكی ئازار بوو بۆ چارەنوسی ئەو، یان گیانم دەرچوو، نازانم ویژدانم چۆن بوو، نازانم فرمێسكی شادی بوو چونكە وەفاداریم بۆ دۆستەكانم نواند ونهێنیەكەم پاراست.

حەبێكی تەواوم بۆ لە چایەكە كرد، بەبزەخەنەوە هاتەوە لەبەر چاوم وەكو نێچیرێكی گچكە بوو، كە بچێتە ناو دارستانی گورگان، بە هەموو دلێكی ساف سەرنجی فرمێسكی منی دا ودەستی بە سرینەوەیان كرد و گوتی: پیاو ناگری، ویستی دلّم بداتەوە وایزانی من پەشیمانم بۆیە دەگریم، نەك بۆخۆم گریانەكەم بەلّكو بۆ چارەنووسی ئەوەو بۆ چاوی من ودلّە سپیە سافەكەی بوو، شەیتانیش لە ناخمدا دەیگوت چاوەڕێ بكە چی بەسەر دێ، هەر سبەی چارەی خۆت وخوشكت دەگرێت، پیویستە ئەویش ئەندێشەی تۆ بزانی ولەگەلّی بژی، چونكە ناتوانی بەرگەت بگرێت، مەگەر خۆی تێبكەوێ، شەیتان بەردەوام خراپەو تاوان وگەندەلّی بۆ دەرازاندمەوە، ئەوجا پێم گوت: با چایەكەمان بخۆینەوە بەشكم تۆزێك هێور ببمەوە، هەتا قسەت بۆ بكەم، ئەوجا خواردیەوە خۆزگە نەیخواردباوە ئەوجا دانیشتم ودەستم بە قسە كرن كرد ئەویش بۆ بەبێهۆش بوون دەچوو، ئەوجا دەستم بەپێكەنین جارێك گریان جارێك كرد نازانم بۆچی پێدەكەنیم و بۆچی

دەگریام وفرمیسك لەسەر روومەتم بوو ئەوجا شەیتان تیختیخەی دام، ئەگەر دایك وباوکم بزانن وخوشکەکەم ببینن بەو حالە بیرم کردەوە لە هەلاتن، گرنگ ئەوەیە دەرپەریم بەرەو لای برادەرەکانم مژدەی کارەساتەکەم دانێ کە بەسەرم هێنابوو، ئەوجا هەموو دەست خۆشیان لێکردم وگوتیان کەس ئەوە ناکات، مەگەر پیاو نەبێ تۆ مەردانەی و تۆ پیشەنگی ومافی خۆتە فەرمان ونەهی بدەو ئەو شەوە نوستین ولەکاتی نیوەرۆ هەستم بە لەرزین کرد ولە خۆم دەپرسی، چیم کردبە دوو دەستی خۆم، چ تاوانێکم کرد؟ پاش دوو رۆژ دایکم وباوکم لە منیان پێچاوە پاش دابرانم، ئەوجا هاورێیەکمان نارده ماڵەوە بۆ ئەوەی بزانن بارودۆخ چۆنە، چونکە من لەوە دەترسام لەوەی کە بەسەر خوشکم هاتبوو، ئەوجا دڵنیایان کردمەوە کە هەموو شتێك تەواوە، هیچ شتێك نەبووە، ئەوجا گەرامەوە ماڵەوە بە ئامادە بوونم بۆ لێدان وجوێن وقسەی ناشرین کە تازە هیچ سوودی نیە، باوکم لێیدام ودایکم وخوشکیشم سەرەکۆنەیان کردم، پاش چەند رۆژێك خوشکەکەم هاتە لام ولەو شتەی پێچاوە کە لە چایەکەم کرد بوو، سەر سورمانی خۆی لەسەریدە برِی داوای کرد و گوتم: نا، ئەوجا دەستی بە پاڕانەوە کرد لێم، وەکو ئەوەی من هاورێکانم داوام لێدەکردن، ئینجا دڵم پێ سوتاو دامێ، چەندان جار ئەو شتە دووبارەبۆوە هەتا باری خویندنی شپرزە بوو، وازی لە خویندن هێنا بەبێ هۆیەکی ئاشکرا کەس‌وکارم دەیان پرسی ئەو کچە بۆ وای بەسەر هات و کۆتایی چی بوو،

بەلاّم هەر کەسێك وەکو ئێمە بایە ئەوا خەونەکانی دەپچران وکەسیش پێی باوەر نەدەکرد وهۆشمەندیش بە خەیالّی دانایێت بگرە گێلیش بەلّکو بەخەیالّیشی دانایت ئەوەی بەسەر ئێمە هاتووە، لە خوێندن ناسیاریم لەگەلّ چەند هاورێیەك پەیدا کرد وەکو قسەو ئاکاریان وەکو هەنگوین بوو، بگرە شیرین تر بوو.

برایەتی وهاوریەتیم لەگەلّ کردن چەندان جار، بەلاّم بە دزی کەس وکارم، ولەخوێندن وبرادەرایەتیم بۆ ئەوان بەردەوام بوو ئاسوودە بووین، بەشێوەیەکی زۆر چاك هەولّم دەدا کەنێوان برادەرەکان وخوێندنەکەم بەیەکەوە ببەستمەوە، نیوە سالّی سەرەتا توانیم ئەوە بکەم، ئەوجا دەستم بە مۆلّەت وەرگرتن کرد چ جۆرە مۆلّەتێك کە هەر بچیّ ونەگەرێتەوە ئەو رۆژگارە رەشە.

باوکم تێبینی کرد کە چوونە دەرەوەم زۆر بووە و بیّ پایەخ بۆ مالّ کەمتر بووە ودایك وباوکم گلەییان لیّ کردم، بەلاّم خوشکم بەرگری لیّ کردم، چونکە زۆر خۆشی دەویستم ودەترسا نەوەکو باوکم لێم بدات، کە ئەگەر تورە ببایە لێدانی زۆر بەئەشکەنجە بوو، رۆژانی پشوو بەردەوام بوو، بە شەوانیەوە، ئەگەر بمزانیبا وام بەسەر دێت، خۆم دەکوشت وبگرە جەستەی خۆم پارچە پارچە دەکرد، تەنیا بۆ ئەوەی تێدا بەردەوام نەبامایە، بەلاّم ویستی خوا بوو.

لەگەلّ برادەرەکانم لە گۆشەی مالّێکی خوێرپیەك بووین، بۆ سەیری ڤیدیۆ

بانگ کرابووین، وێرای پێکەوە وگاڵتەو گەمە بکەین، جا لەمەغریبەوە دانیشتین تا یازدەی شەوە کە کاتی گەڕانەوەمان بەرەو ماڵەوە هات، بەڵام خاوەن ماڵ داوای لێکردم کە نیو سەعاتی تریش بمێنێمەوە، ئینجا هەموومان پێکەوە بگەڕێینەوە، ئەرێ دەزانن نرخی ئەو نیو سەعاتە چەند بوو؟ هەموو تەمەنم بەڵکو تەمەنی دایك وباوکم و بگرە تەمەنی سەرجەم خانەوادەکەمان بوو.

بەڵێ ئەو نیو سەعاتە نرخی هەموو تەمەنمان بوو بۆ گوێزانەوەمان لە بەختەوەری بەرەو بەدبەختی هەمیشەیی، بەڵکو ئەو نیو سەعاتە هۆکاری گواستنەوەم بوو بۆ ئاگریك کەوا داخمان کات، بۆ کەسیك کە مەگەر بەدبەخت بێت (ببورە لەسەر گوزەشتەکەم دەرچووم).

برادەرێك خۆی پێشنیاری کرد، بۆ ئەوەی چاپەستێك چامان بۆ لێبنێ بۆ کۆڕەکەمان تاکو کاتەکەمان پێ بکوژین، ئەوجا چاپەستە چایەکی هێنا وتێی کرد، لەو کاتەی کە قسەو گاڵتەمان دەکرد بە هەموو مانای پاکی وخۆشەویستی وبێ بەری خۆمان، بەنیازێکی پاك، بەڵام پاش ئەوەی چاکەمان خواردەوە بە ماوەیەکی کەم وامان لێ هات کە بەلابێین وپێبکەنین ودەست بەرشانەوە بکەین، نەمزانی چمان بەسەر هات کاتێك بە هۆش هاتینەوە، من یەکەم کەس بووم، ئەوجا خانەخۆیەکە هەستا دەستی بە گلەیی وگازاندە کرد لێمان لەسەر ئەوسا کە ڕووی دابوو، ئێمە نەمان دەزانی چی ڕووی دابوو بۆچی ڕوویداوە ؟! ئەوجا دەستمان بە گلەیی

کرد لە چایەچیەکە ئەوجا وەڵامی داینەوە و گوتی: ئەوە پێ ڕابواردن بوو، ڕامان بووارد، ئینجا بە خۆمان وئەوێمان پاککردەوە لەو ماڵە دەرچووین بەرەو ماڵەکانمان گەڕاینەوە.

کە گەیشتمە ماڵەوە، دەنگی چۆڵەکەی بەیانی دەهات وخەڵکیو نوست بوون تەنیا خوشکم نەبێ منی بردە هۆدەکەی خۆی وئامۆژگاری کردم وهەرەشەی لی کردم جارێکی تر دووبارە نەبێتەوە درەنگ بگەڕێمەوە، ئینجا پەیمانم دایی بەڵام داماو لە خۆی نەیزانی ئەو هەڕەشەیە هەرەشەیەکە لەسەر ژیانی ئەو پێش من، خۆزگە چاوپۆشی نەکردبام خۆزگە لێیدابام، نەك هەر ئەوە خۆزگە بەڵکو بیکوشتبام.

پاش چەند رۆژێك لەلای برادەرێکی دیکە کۆ بوینەوە، ئەوجا داوای هەمان ڕابواردن وگاڵتەو گەمەی جارانمان کرد، چونکە پێمان خۆش بوو شەیدای ببوین، هاورێکەمان پێی گوتین ئەوە بە پارەیەو بە نرخێکە بەتەنیا ناتوانی بیکری، ئەوجا پارەمان کۆ کردەوە بە ژمارەی خۆمان کەپسولمان پێ کری، وا بزانم ئیستا دەزانن چی بوو؟

ئەوە ماددەی بێ هۆشکەر بوو(موخەدەرات) ئەوە ڕابواردن بوو بە گولاجی حەشیشەو تریاك، کە بەراستی گاڵتەوگەمەمان بەناگر دەکرد!.

ڕێك کەوتین کە هەر لەناو دوو هەفتە ئەو کارە دووبارە بکەینەوە لەلای برادەرێکمان وگولاجەکەش بەپارەی هەموومان بکڕین.

رۆژگار تیپەرین ولەقوتابخانە شپرزە بووم، ئەوجا بابم گواستمیەوە بۆ

قوتابخانەیەکی تایبەتی بۆ ئەوەی رزگار بم لەو دواناوەندیەو دەربچم، خەونەکانی خۆم و دایك و باوکم کە فرۆکەوانی بوو بێ ئەنجام بوو، کام ئەندازیار لەمن چاوەروان بکرێ، بەخوا تاوانی من نەبوو نەشم دەزانی ئەگەر پێشنیاری من بکرابا رەتم دەکردەوە وهیچم نەدەویست، تەنیا گاڵتە و گەمەکەم نەبێ، نەفرەتی خوا لەوەی گاڵتەی پێ دەکات، رێی پێدەدا بۆ لاوانی موسڵمان، رۆژگار تێدەپەرێت ئێمەش لە دانیشتنەکانمان بەردەوام بووین، بێ ئەوەی کەس بزانێ، وام لێ هات، نەتوانم لێی دوور بم و لەبرادەرەکانم، ئەوجا دەرنەنجامی ساڵ دراوە کە مایەی بێ ئومێدی بوو بۆ هەموو کەس و کارم، بەلاّم خوشکم دەرچوو بەنمرەیەکی بەرز، پیرۆز بایم لێ کرد بە هەموو دڵسۆزیەکم، هەرچەندە خۆشم غەمبار بووم، پیم گوت: کەیەکەم ودواجار بوو هەستم بە دڵخۆشی خۆم کرد ولەقوڵایی دڵم پێم گوت: چیت دەوێ بۆت بکرم، دەزانن چی پێ گوتم: وەکو ئەوەی لەگەڵ من وهاوریکانم ئامادە بێ و بە حاڵمان بزانێ گوتی: دەمەوێ براکەم وریای خۆت بی چونکە پاش خوا تۆ پشت وپەنای... ئەو قسانەی کرد لە رۆژێکدا کە نەیدەزانی دەبێتە یادگاریەك بۆ پاشەرۆژم کە لەچەقۆ تیژ تر بێ خۆزگە نەیگوتبا، خۆزگە منیش لێم نەپرسیبا.

چ شانازی وپشتیوانیەك لەمن چاوەرِی دەکرێ، خوا پشتیوان وچاکترین بریکارە، خوشکەکەم چووە ئامۆژگاری مامۆستایان هەوڵ وماندو بوونیدا، منیش دەرنەچوون لەدوای دەرنەچوون لە گومرایی وتاریکی بەرەو

ئەوجا تەما بووە برام گچکەکەی خۆم و جاریك کەلو پەلەکەم نەمابوو لە برادەریك داوام لیّ کرد یارمەتیم بدات، ئەویش رەتی کردەوە تەنیا مەرجیّکی هەبوو(خوا پەنامان بدات) دەیویست لەگەلّ خوشکم بکات، منیش رەتم کردەوەو شەرم لەگەلّ کرد، هاوریکانیش دەیان ویست پیّکمان بیننەوە و دەیان گوت: جاریك هیچ نییە ولیی بپرسە ئەگەر خۆی رازی بوو تۆ چ زەرەر دەکەی، تۆ هیچ زەرەر ناکەی هەموبان بونە لای ئەو ودژی من راوەستان.

پیّم گوت: تۆ یەکەم کەس بووی کە بە منت دەگوت من پشتیوانتم بۆ دەرمان وچارەسەری خوشکەکەم ئەمرۆش ناوا داوای دۆراندنی دەکەی.

ئینجا پڕ بە زاری گوتی: کام برادەراتیو چ چارەسەریەك، پەیوەندیان برا وڕۆژگاریّکی دریّژ بەسەرچوو خۆم وخوشکم نارامان گرت، خوشکەکەم بەردەوام داوای لیّدەکردم ومنیش نەمبوو، باری خوشکەکەشم رۆژ بەرۆژ خراپتر دەبوو هەموو داوای ئەوە بوو ئەگەر دەنکەك حەبیشی بۆ پەیدا بکەم، ئەوجا شەیتان تیختیخەی دام ولیّم پرسی وپیم گوت: ئەو کەسەی کە حەبەکەی هەیە، یەکەم جار تۆی دەویّ ودەیەویّ بت بینیّ وئەوجا هەرچی بانەویّ بە خۆڕایی دەماندات و ئەوجا گوتی: ڕازیم با بڕۆین، تەگبیرمان کرد کە خۆم وخوشکەکەم رۆیشتین و چووین، خوشکەکە م بۆ هاوریّکەم برد ولە شوقەکەی دانیشتین.

داوای لیّکردم کە پیاسەیەك بکەم، هەتا تەواو دەبیّ، خوا نەفرەت لە

من وبرادەرەکەم و شەیتانەکانم وحەبەکەو بەکار هێنەری بکات، پاش سەعاتێك هاتمەوە، خوشکەکەم نیمچە رووت بوو لە شوقەی هاورێکەم منیش بە کارەکە دۆرا وبووم هەرسێکمان لە نیوەرۆوە هەتا عیشا دانیشتین لە کۆڕێکی رابواردنو خواردنەوە ولەش فرۆشی، هاوار لە خۆم، هاوار لە دەست پەروەردگارم، هاوار لە ئاگر من شایستەی ئاگرم، من شایستەی ئاگرم، خۆزگە بمردبام، خوایە بم کوژە خوایە بمکوژە من چاوەرێم وشایستەی ژیان نیم، هەر بە خوشکم دەگوت: جاری یەکەم ودوا جارە بە هورێنە دەمگوتەوە، هاورێ پیسەکەم، ژوان وژمارەی تایبەتی خۆی دایە خوشکم بۆ هەر کاتێك بیەوێ، پیویستی بەمن نەبوو، من نەمزانی رۆژگارێك تێپەری هەر دەمدیت کە خوشکم دەردەچوو بە بێ دەم وجەم، کە خوشکەکەم بەبێ پیویستی دەردەچوو بۆ بازاڕ ونەخۆشخانە وهەتا وای لێهات خۆی قوتار دەکرد، بەبیانۆی چوونە نەخۆشخانەو جارێکی تر خۆی بۆ خوێندن نەنووسیەوە.

باوکی داماوم بە هەموو توانایەکی هەوڵی دا کە وابکات هەر چۆن بێت خوشکەکەم بگەرێتەوە بەر خوێندن، بۆئەوەی خۆشیەك بگەرێتەوە ناو خانەوادەکەمان، رۆژێکیان هاورێیەکم گوتی: بابچینە سەردانی هاورێیەکمان، ئێمە چوین بەلاَم چیم دیت، بینم وا خوشکەکەم وا لەباوەشی دایە وزیرەم لێ هەستا، ئەوجا خوشکم هەستاوەو گوتی: تۆ چیت لە منە من ئازادم، ئەوجا برادەرەکەم منی لەگەڵ خۆی برد و

ژەقنەبوتێکی دامیٚ، کەوا مرۆڤ توشی لـەبیر چـونەوەی بـەرێزترین شـتی خۆی دەکات وای لێدەکات کەلەبەر چاوی قیزەون و بیٚ قیمەت ترین شـت بیٚ و شتە پیرۆزەکـان لای سـووك بێـت، گەڕاینــەوە لای برادەرەکــەمان و منیش لەویٚ بووم و دیتم دەستبازییان لەگەڵ خوشکمدا دەکـرد ومنــیش وەکو گوێدرێژ بەڵکو پوچ تریش لەگەڵیان دابووم، کە نەفرەتیان لە ژیـان و چارەنوس دەکرد.

لەگەڵ کاتی عەسر گەڕاینەوە ماڵ و من نەمـدەزانی چـی بکـەم، چـونکە نابرووی ماڵ و شکۆمەندی و چـارەنووس و هـۆش هـەموو رۆیـشت بـوو بەراستی هەموو شـتێك چـوو و چـەند ڕۆژێـك تێپــەڕی لــەکاتی بێـداری دەگریام و لەکاتی بێهۆشی وەکو نـاژەڵ پێدەکـەنیم لـەژیانێکی چـەپەڵ و ناشرین وپروپوچ گێرەم دەکرد.

ڕۆژێك سەعات نۆی بەیانی پۆلیس پەیوەندیان بە باوکمەوە کرد کە لەسەر ئیش بوو گوتیان: دەبێت زوو بێی ئامادە بیت، کە ئامــادە بـوو بەرگــەی کارەساتەکەی نەگرت، پاش چەند ڕۆژێکیش مرد دایکم لـەزمان کـەوت، دەزانن بۆچی؟

دەزانن چی بوو؟ خوشکەکەم لەگەل گـەنجێك دابـوو لەشـوێنی (ڕابـواردن) پشوودان لەدەرەوەی شار، بەسەرخۆشی تووشی کارەساتێك ببوون وهەمان کات گیانیان لەدەست دا بـوو، ئـای چ کارەسـاتێك بـوو بـەردی بـەزمان دەهێناو چیای دەهێنایە گریان.

ئای كە كۆتایــەكی ڕەش وشــووم بــوو كەقــەت خوشــكەكەم نەیدەویــست وخۆزگەی بۆ نەدەخواست وهەڵیشی نەبژاردبوو چونكە خوشــكێكی داوێــن پاك بوو، لەشەرمەنفمەندی بووە بەداوێن پیس ولەشفرۆش، خوشكە باوەڕداره چاكەكەم بوو، خوایەگیان چیم بەسەر خوشكم هێنا، ئاخۆ ئەو ڕێچكە چــی بوو كە پێی بردمە دۆزەخ، بەدەستی خۆم گەیاندمە ئــەو ئــەفرەت كراویــە ئەوناو بانگە شوومەخوایە چی بكەم! خوایە داوا دەكەم كەوا من ببەیتەوە ولەجیاتی ئەو سزام بدەی، خوایە خۆت دەزانی كە ئــەو ســتەم لیّ كــراوەو من ستەمم لیّ كرد، من دۆڕاندم وئەویش هیچی نەدەزانی و نەفام بوو.

ئەودەیویست من چابكات، بەڵام من گومڕام كرد، نەفرەتی خوا لەماددەی هۆشــكەر وتریــاك وخــاوەنی، بــاوكم كۆچــی كــرد ودایكــم زمــانی گــیرا ولەوڕۆژەوە منیش تا ئێستا لەسەر كــوێرە ڕێــچكەی خــۆمم وبراكانیــشم لەسەر ڕۆخی تێچوون ودۆڕانن، ئەوجا پاش ماوەیەك بیرم كردەوە كە تۆبــە بكەم وئارامم، ئەما، ئەوجا داوام لەدایكم كرد كە مۆڵەتم پیّ بدات وبچمە دەرەوە بۆ ئەوەی خەمەكانم كەمێك لەبیر بكــەم ڕابــوێرم، بــەڵام چــوومە نەخۆشخانەی(ئەمەل) بۆ چارەسەری مادە هۆشبەرەكان پاش ئەوەی ژیانی خۆم وهەموو خانەوادەو خوشكمم وێران كرد.

خوا لە خوشكم خۆش بیّ وخوایە لێی ببوورە خوایە ڕەحمی پــیّ بكــە ئــەو داماوو بیّ دەسەڵات بوو من لەجیاتی ئەو سزابدە.'

سوور بووم لەسەر چارەسەری، كەلێیان دەپرسیم دەربارەی ماددەی هۆشبەر

دەمگوت لەدەرەوە فێربووم هەرچەند لەبیرم نەدەچوو، پاش چەند مانگێك چارەسەر کرام لەدەرئەنجامی ئەو بیهوشیەی کە تووشی ببوم.
بەڵام پاش چی، پاش ئەوەی هەموو ژیانێکی بەختەوەرو ئاسودەم لەدەست چوو، لەو کاتەی کە لەو پەڕی هەبوونی بووم وگەیشتینە ئەوەی بەیارمەتی خەڵکی بژین، ئەوجا دایکم خانووەکەی فرۆشت وشوقەیەکی سێ ژووری کەئێمە هەشت کەس بووین بەکرێ گرت، پاش ڤیللایەکی دیلۆکس وپاش گوزەرانێکی پڕنازو نیعمەت وسەربەرزی وخۆشی بەرەو تەنگەبەری ودەست پان کردنەوە وبێ زانیاری وبی کاری براکانم کە نیوەیان لەبەر نەبوونی قوتابخانەیان بەجێ هێشت، لەبەر مەسەلەی خوشکەکەم کە نەفرەت و تیر وتوانجیان لیدەدان وهەست ونەستیان بریندار دەکردین، هەموو نزای خراپی خەڵکی بوو بەئاگر، ئەمەش دەبووە هۆی دڵپێ سوتانم هەرچەندە ئەو ستەم لیکراوبوو وێرای خانەوادەکەم بەڵام نەیان دەزانی کە کێ بوو بەهۆکاری ئەم ماڵ کاولیمە.
ئێستاش ناتوانم ڕاستی دەربارەی برادەرە خوێڕیەکانم بدرکێنم، ئەو برادەرانەی کە من و خوشکمیان ویران کرد، چونکە ئەگەر ئاشکرای بکەم زیاتر برینی خانەوادەکەم قووڵ دەکەم، کەهیشتا سارێژنەبووە لەکارەساتی خوشکم ودایکم وباوکم وناوبانگی زڕاو ونامووس وچاو شۆڕیان، چونکە ئەگەر بزانن ڕاستی مەسەلەکە برادەرە پیسەکانیشم، دێنە ناو مەسەلەکە وئیستاش من سەرسام وهەمیشە کارم گریانەو کەسیش پێم نازانێ،

بەڕاستی من شایەنی ئەوەم کە بەردباران بکرێم ئەوەندە بەس نیەو بەش ناکات لەسەر تاوانەکەم.

برایان سەرنج بدەن چیم بەسەرهات کە هۆکارەکەی تریاك وڕابواردنی شەیتانی بوو، بەڕاستی حەشیشە سەرچاوەی هەوو چەپەڵیەو سەرچاوەی وێران کردنی چەندان ماڵ وبەتبەختکردنی چەندان مرۆڤەو چەندان خێزانی لەبەر یەك ترازاندوە، پێم پێمەکەنن برایان سەرتان سوڕنەمینێ بڵێن خوایە چاومان لێی نیە.

براینە سەرگوزەشتەکەم بخویننەوە وپەندی لێوەربگرن وبلاّوی بکەنەوە بۆ هەر کەسێك کە دەیناسن، بۆ ئەوەی خوا ڕیگای ڕاست ودرووستی نیشان بدات هەتا ئەگەر کەسێکیش بێت، بەشکو بە هۆی ئەو خوای گەورە لەمنیش ببوورێ هەرچەندە وادەزانم کە قەت من شایەنی لێبووردن نیم.

توخوا تکاتان لێ دەکەم، کە شەو وڕۆژ بۆ خوشکەکەم بپارێنەوە، بەڵکو بە نزای ئێوە خوا لێی خۆش بێت، لەبەر ئەوەی نزای من گیرا نابێت چونکە هەرچی بەسەری هات من بەسەرم هێناوە.

خوایەگیان ڕەحم بەخوشکەکەم بکە ولێی خۆش بە، بەخوا من پێویستم بە هەڵوێستی ئێوەیە کە لەگەڵم بن لەتەنگژەکەم بەلاّم هیچم لێتان ناوێ، هەروەها سوپاسی براکەم دەکەم کە هەستا بەنووسینەوەی ئەندێشە وکۆستەکەم کەئێستا لەبەر دەستتان دایە وبەهاوڕێی ڕاستەقینەی خۆم دەزانم وخوا پشتیوانی بێت.

سوپاسی هەر کەسێك دەکەم کە بلاوی بکاتەوە کە ئەوەش کورتکراوەی سەرگوزەشتەکەم بوو کەئەگەر بۆتانم بگێرابایەوە بێزتان دەبۆوە لەخۆتان و لەشەرمەزاری من چاوتان دەنوقاند، بە ئومێدم سوودێکم پێتان گەیاندبێت.

# ﴿ هیدایەتی خوا ﴾

حەز دەكەم خۆتان پێ بناسێنم، من كچێكم لەخانەوادەیەكی بەرێز بەلاَم پەیوەندیم بە ئاین كەم بوو، دایكم بالاَپۆش نەبوو، نەم دەدیت باوانم نوێژبكەن، هەر ئەوەندەم دەزانی من موسلّمان بووم لە قوتابخانەیەكی (رەبەنەكانی) فەرەنسی پەروەردە بووم، هەموو حەزم جل و بەرگ و یانەو هاورێكانم و ئاهەنگەكان بوو، هەموو جۆرە جلێكی نارێكم لەبەر دەكرد بە چاوی سووك سەیری بالاَپۆشەكانم دەكرد بەوەی كە پاش كەوتو و ناشارستانین، دەمگووت ئایا رووخسارو قاچ و دەستەكان وروژانیان هەیە ؟

هەتا ئەو كاتەی خوشكە گەورەكەم لەگەلّ هاورێیەكی كەمێك دیندار هاوسەری كرد، ئەو هانی خوشكەكەمی دەدا، لەسەر نوێژ كردن و قورئان خوێندن خۆی پۆشتە كردو داواشی لەمن كرد بەهەموو رێگایەك، بەلاَم هەموو هەولّەكانی سەریان نەگرت و پووچ بوونەوە، لەداخان دەگریاو دایكیشم هانی دەدام، خوشكم دەستی بەروومەوە دەنا، لەمانگی رەمەزان خوشكەكەم دەچووە مزگەوت بۆ نوێژی تەراویح، منیش رۆژێك لەگەلّیدا چووم نەك بۆ نوێژ كردن، بەلاَم تەنیا بۆ رابواردن و پیاسە بوو، كاتێك كە چوومە ناو مزگەوت هەستم بەكەمێك ترس كرد، جێگایەكی نامۆ بوو بۆ

من، دیتم ژنان قورئان دە خوێنن و دەگرین، هەندێکیان بە خشوع نوێژیان دەکردو هەندێکیان لەوێ (هەر لەناو مزگەوتدا) خوێنی خۆیان دەبەخشی، پێش نوێژەکە دەستی بە نوێژ کردو هیچ بە وردی بیرم لەتاکە وشەیەکیش نەکردەوە، پاش نوێژ کردن مامۆستایەکە دانیشت کە مامۆستایەکی ناسراو بوو، دەستی بەباسی گێڕانەوەی ژیاننامەی خۆشەویست ﷺ وخێزانەکانی کرد، ئەو باسە سەرنجی ڕاکێشام، ڕۆژی دوایی دیسان چوومەوە بۆ تەواو بوونی باسەکە و ڕۆژ بە ڕۆژ وام لێ هات شارەزایی دەربارەی ئیسلام پەیدا بکەم، هەوڵمدا قورئان بخوێنم بەلاّم بۆ من گران بوو، کە تێی بگەم و بیخوێنم، دەستم بە پاڕانەوە لەخوا کرد، کە هاوسەرێکی وەکو خوشکەکەم (زاواکەمان) بەنسیب بکات بۆ ئەوەی ڕێنمونیم بکات بەرەو خودا، لەدووەمی ناوەندی کە چوومە ماڵەوە دیتم دەستە خوشکێکی کۆنی دایکم میوانمان بوو کەلەسەردەمی خوێندن پێکەوە بوون کە پێش (٣٠) ساڵ لێك دابڕابوون، بەڕێکەوت دایکمی دیتبو و هاتبووە سەردانی و کوڕێکیش لەگەڵی دا بوو کەتەمەنی (٢٦) ساڵان بوو، کە زۆر قۆزو دەرچووی زانکۆ بوو، خاوەن پیشەکی ڕێك و پێك بوو لەوڵاتێکی عەرەبی، بە تەما بوو لەماوەی هەفتەیەك بگەڕێتەوە، منی دیت دڵی گرت و داوای کردم، بەلاّم ڕەتمان کردووە لەبەر گچکەیی من، لە دواناوەندی بەنمرەیەکی باش دەرچووم، چوومە کۆلێژی گەشت و گوزارو میوانخانەکان کە بەدرێژایی تەمەنم خەونم پێوە دەدیت، نەخشەم

دادەنا کەوا بەو هۆیە بەتەنیا گەشتێکی زۆر بکەم بۆ ولاتانی زۆر، کۆمپانیایەکی زۆر بناسم، ببمە خاوەنی ئۆتۆمبێل و سامان و زۆر شت، بەلاّم کورەکە هاتەوەو دیسان سوورِ بوو لە داخوازی کردنم، هەرچەندە مالّەوەمان رازی نەدەبوون لەبەر خوێندن و تەواو نەکردنم بوو .

نامەوێ درێژەی بدەینێ، مێردم پێکردو چووینە شاری (جدده) پاش هەفتەیەك عەمرەم بەجێ گەیاند و پاش (٣) مانگ حەجیشم کرد، خۆم بالاّ پۆش کردو پابەند بووم و لەخوا نزیك بوومەوە، هەر دوو مانگ جارێك دەچوومە مەدینە، وام لێهات هەموو رۆژێ نوێژی رۆژئاواو خەوتنانم بە کۆمەلّ دەکرد لە مزگەوت، کاسێتی قورئانم پەیدا کردو فێری قورئان خوێندن بووم، چوار جوزئم لەبەر کرد، کتێبی زۆرم لەسەر ژیاننامەی ﷺ کری، وێرای فەرموودەو کتێبی فیقهی و جێنشنە بەرێزەکانی خۆشەویست ﷺ و پابەندی ئەوان بووم و ئێستاش تەمەنم (٢٦) سالّە، بالاّ پۆشم و خۆم میکیاج ناکەم و رەنگی زرقی و برقی لەبەر ناکەم و رۆژ بە رۆژ بەرەو هیدایەتم، وام لێهاتووە بوومەتە مامۆستایەکی بانگخواز لەنێوان خانەوادەو کەس و کارم، زۆر پرسم پێ دەکەن دەربارەی ئایین، هەتا ئێستاش نازانم کە چۆن ئەو هاوسەرگیریە روویدا ؟ چۆن ئەم کۆنە دۆستەی دایکم پەیدا بوو، پاش ئەم هەموو سالّە درێژە! نازانم چۆن وا بەئاسانی و هەرەمەکی رازی بووم، لەسەر ئەو مارە برِێنە لە کابرایەك کەهیچم لێی نەدەزانی و چۆن بەئاسانی دەسبەرداری خوێندنەکەم بووم !

نازانم چۆن ملکەچ بووم بۆ هاوسەری کابرایەك لەماوەی تەنیا سێ مانگدا لەکاتێکدا، سوور بووم خوێندنەکەم تەواو بکـەم بـۆ گـەڕان و سـوڕان بـە وڵاتاندا، نازانم چۆن ڕازی بووم کە لەگەڵی کۆچ بکەم بـەرەو وڵاتێـك کـە کەسم لێی نەدەناسی ! ئەویشم نەدەناسی .

بەڵام لە کۆتاییدا دەڵێم بەڕاستی خوا ویستی کە چام بکـات لەسـەر ئـەو هەموو شتانە وای لێ کردم کە ناچار بم، بۆ ئەوەی ڕزگار بم لـەو شـتانەی کەمن هەواداری بووم و لەمانە ڕزگاری کردم بـەرەو ڕێگایـەکی ڕاسـت و دروست .

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنموێنی کردم بـۆ ئـەوە، بەڕاسـتی قەت ڕێگای ڕاستم نەدەدۆزیەوە ئەگەر ئەو بەرچاوی ڕۆشن نەکردبام، مـن فریشتەکان و خزمەتکارانی بارەگـای خـواو و هـەموو دروسـتکراوەکان و ئێوە بەشایەت دەگرم کەمن تۆبەم کردووەو گەڕامەوە بەرەو خوا، پاکانەی خۆم دەردەبڕم لەوەی کردوومەو پەشیمانم، لەخوا داواکـارم کەلـەمن و لـە ئێوەش خۆش بێ، لەبەهەشتی چاوەڕوانی شادمان بکات .ئاین.

# ﴿خواست و وره بەرزی﴾

تـەنیا هـاوڕێی مـن نـەبوو بـەڵكو .... خاكێیـە بـێ وێنەكـەو ئاكـارو هەڵسوكەوتی جوانی لەگەڵ خـەڵكی ..... وای لێ كردبـووی ناسـراو بـێ لەلای هەمووان كە لەگەڵ كچە قوتابیانی زانكۆكەمان نیشتەجێ بوو .... لەقۆناغی كۆتایی پزیشكی دەیخوێند .

﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَـٰٓؤُا۟ ۝٢٨﴾(فاطر)

قـەت نەمـدەزانی خوێنـدنی پزیـشكی ئەوەنـدە پەیوەنـدی مـرۆڤ بـە پەروەردگاریەوە پتەو دەكا، بەو شێوەیە ناوم بیست و چـاوم پێـی كـەوت ڕێزی دینداریيەكەم گرت .

ئەو كچە قوتابییە خەڵكی ولاتێكی كەنداوی عەرەبی بوو، هاتبووە (ڕیاز) بۆ تەواو كردنی كۆلێژی پزیشكی لەگەڵ هاوڕێكانیدا، كاتێك هەواڵی ئـەو كچەیان بیست كە تووشی نەخۆشی بوو، هـەموو لەناخـەوە تووشـی خـەم بوون، ئەوەش لەكاتی پشووی هاویندا بـوو، دەسـتە خوشـكە نزیكـەكانی بـەردەوام لەپەیوەنـدی دابـوون لەگـەڵی، لەسـەر ئـەوەش كـە بەدەسـت نەخۆشییەوە دەینالاند، بەلاّم هـەمووان لەگـەڵ دەسـپێكی سـاڵی تـازەی خوێندن تووشی سەرسوڕمان بووین كاتێك دیـان سـەرەڕای نەخۆشـیەكەی گەڕا بووەو لەگەڵ خۆمان دیتمانەوە، هەرچـەندە بـەردەوام چـاوپێكەوتنی چارەسەری هەبوو و ئاسەواری نەخۆشی بەتەواوی بە ڕووخـسارو پرچـیەوە دیار بوو و وێڕای شەكەتی و ئازاری نەخۆشیەكی كوشندە .

پێمان گووت : بۆچـی گەڕایـەوە ؟ باشـتر نـەبوو کـە لـەنێوانی خێـزان و خۆشەویستاندا، واتە ئەو چەند ڕۆژەی کە لەژیاندا ماوە ؟ بەڵام وەڵامـی من و هـەمووانی داوە لـەکاتی پێـشوازیمان، کـە بەڕاسـتی ئاسـەوارێکی کاریگەری لەدڵ و دەروونی، هەموومان لەسەر ئەو کارو بڕوایـەو متمانـە پیرۆزەی کە پەروەردگاری هەیبوو . . . . . گـوتی : بەڕاسـتی خوێنـدنی زانستی پزیشکی پەیوەندیەکی پتەوی دروست کـردووە لـەنێوانی خـۆی و پـەروەردگاری، وە بەڕاسـتی هـەرخوا دەزانـی کـەمن هـەموو ڕۆژگـاری خوێندنی و ئاوارەیی تـەرخان کـردووە، بـۆ ئـەو دەرئەنجامـەی کەدەبێتـە مایەی خزمەتگوزاری، بـۆ ئیـسلام و موسـڵمانان، بـۆ ئـەوەی خزمـەتی ئوممەتی بکات، هەتا دوا سـات لەژیانیـداو ئـەو ئۆمەتـەی کـە چـاکترین ئۆمەتە بۆ مرۆڤایەتی لەلایەنی ئاین و زانست و ڕەوشت .

خۆزگەم دەخواست کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببامە ئەو پزیشکە موسڵمانەی کە لەخوا دەترسێ و موسڵمانان لەدڵی دان، هەموو زانست تواناکانی دەخاتـە گەڕ لە پێناویان، ئێستا کە گەیشتمە ئەو قۆناغەی زانـست تووشـی ئـەو نەخۆشیە بوومە، لەلایەکی تر خۆزگەم لـەخوا خواسـت کەتەمـەنی درێـژ بکات، بۆ ئەوەی ببێتە یەکێك لەو کەسانەی کە بەدوای ئـەو نەخۆشـیەدا دەگەڕێن بۆ چارەسەری لێکۆڵێنەوە دەکەن .

بەڵام ڕۆژگـار سـەرجەمی بەدەسـت خوایـە، سـوپاس بـۆ خـوا سـەرەڕای ئەمانەش کەس تووشی تاقیکردنەوە نابێت مەگەر باوەڕداران نەبن، کەس

بەقەد خۆشەویست ﷺ تووشی تاقیکردنەوە نەبووە، وێڕای موسڵمانە پێشینەکان چەندان جار دووچاری بوونە لە ئێمە زیاتر، تووشی بوونی ئەو کچە بەو نەخۆشیە ئایا واتای ئەوە بوو، دەستبەرداری کارکردن بێت . . . راستتر ئەوە بوو شان بداتە بەر کارەکەی کە دەستی پێ کردبوو، سەرەڕای ئەوەی تێوەگلاییەو ململانێی مردنی دەکرد، بەلاّم چاکی دەزانی کەوا پاداشتی لای خوا بەفیرۆ ناچێت، ئەوە گوتەی خۆی بوو خوا ڕەحمی پێ بکات و لەبەهەشتی خۆی بیگێڕێنێتەوە –بەڕاستی کەسەری نایەوە، لە ڕێگای زانکۆ لەپێناوی خوێندن کۆچی دوایی کرد تەرمەکەی ناردرایەوە نیشتمانەکەی خۆی، بەڕاستی سەرجەمان زاناو پزیشکێکی موسڵمانم بوو، کۆچەکەی بەرەو سەکۆکانی ڕووناکی بوو .

مردن و بەرەنگاربوونەوەو ئازایەتیەکی زۆر کاریگەری لەدڵمدا هەبوو . . . . بەڕاستی مەرگی ئەو بوو مایەی ژیان بوو بۆ من ئاشنایەتی بوو، خوا لێی خۆش بێ .

بـــــــەپشتیوانی خوای گەورە تەواو بوو

بـــــــە ئومێدی پاداشتی خوای گەورە و دوعای خێرتان

وەرگێڕانی: عبدالجلیل

هەولێر- کوردستان

١ - ٥ - ٢٠٠٧






ناو : عەمر محەمەد حیلمی خالید
ڕۆژی لەدایك بوون : 1967/9/6 ئەسکەندەریە

پلەی خوێندن : بڕوانامەی بەکالۆریۆس
لەبازرگانی - زانکۆی قاهیرە 1988
ئەندامە لەکۆمەڵەی ژمێریاری میسری

خوێندن لەبواری ئایینی: دەرچووی پەیمانگای
خوێندنی ئیسلامی یە قوتابی ماجستێرە
لەئابووری ئیسلامی ژمێریاری یاسایی یە لە
دامەزرێنەرانی نووسینگەی ژمێریاری عەرەبە.

باری کۆمەڵایەتی: خێزاندارە
کوڕێکی بەناوی (عەلی) هەیە.

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
هەولێر - بازاڕی ڕۆشنبیری تەنیشت تاپۆ
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر

نرخی 3000 دینارە